

## وشەی پرشنگدار

**بە بێ خۆ بەستنەوەو بە بێ دوو دڵی و بە بێ ترس بنووسن ئەگەرچی دەوڵەت رازی بێت یان رازی نەبێت لەوەی دەینووسن...**

**سەرۆکی فەرمانده**
**صدام حسين**

# لەم ژمارەیەدا

# بەیان

کۆڤارێکی مانگانەی ئەدەبی‌یە

## سەر نووسەر
## مصلح جەلالی

سکرتێری نووسین: فؤاد حسین

**دەستەی نووسەران**

د. أحسان فؤاد
د. عزالدین مصطفی رسول
محمد مصطفی حەمەبۆر
مصطفی صالح کریم
احمد سالار
محمود زامدار
حسین احمد الجاف
صبری بوتانی
أحمد عبدالله زەرو
عبدالکریم فندی دۆسکی

مۆنتێف و خۆش نووس: سزار بەراز

ناونیشان

دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی
وەزیریە تەنیشت المعهد القضائي
ت ٤٢٥١٨٤٦ پێنج خەتە

بەرگی یەکەم: وێنەیەك لە کوردستان
بەرگی دووەم: ئەلیسەرکی بەبونەی ٨/٨/١٩٨٩ تابەوە رۆژی سەرکەوتن و ئاشتی

ئابوونەی سالانە لە ناو عیراقدا ١٠,٠٠٠ دینارە

تکایە هەر نووسەرێك خەتەکەی خۆش و شاش و جوان نەبێ نووسینەکەی دەخرێتە پشت گوێ



# صدام حسين خۆشەویستمان

● حسن حسين الله داد ●

لەم ڕۆیشتنەی دواییم بۆ دەرەوەی وڵات چاوم بە هەندێ لە ڕۆشنبیرانی ئەوێ کەوت و باسی عیراق و سەرکەوتنەکانمان چ لە بارەی شەڕی دوژمنکاریی ئێران کە بەسەر عیراق دا سەپاندیان و چ لە بارەی بەردەوامیی کارەکانی بنیاتنان و بەرهەم هێنان و شارستانی یەت کرد، بینیم لە زۆر شت دا ئاگاداری ئەم هەموو سەرکەوتنانەن. ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ چالاکیی دەزگاکانی ڕاگەیاندنمان و بۆ ئەو عیراقی یانەی کە لە دەرەوەی وڵاتا دەژین.

یەکێك لەو ڕۆشنبیرانە وتی: بە ڕاستی ئێوەی گەلی عیراق زۆر بەختەوەرن چونکە **سەرکردەیەکی زۆر ڕۆشنبیر و داناو ئازا هەتانە**، کە خاوەن تەجرەبەیەکی فراوانەو توانیویە خاکی وڵاتەکەتان بپارێزێ و سەربەرزی و بێ باکی شایانی ئێوەیە، چونکە ئەو قارەمانە بەرێزە هەڤاڵ صدام حسين ڕابەرایەتیتان دەکات و خەم و پەژارەتان لەگەڵدا دەخواو بەردەوام لە خۆشی و شادیدا لەگەڵتان دایەو ئێوەی خۆش دەوێ.

منیش ڕاستت دەوێ هەر ئەوە مابوو لە خۆشیا باڵ بگرم و بە ئاسمان دا بفڕم.. ئای چەند دڵ و دەروونم خۆش بوو، ئەمە وای لێ کردم ئەگەر بە دەستم بوایە یەکسەر دەگەڕامەوە بۆ وڵات و سەرکردە خۆشەویست و دڵسۆزەکەم. صدام حسين.

**پێیم وت: برا هێشتا تۆ زۆر کەمت لە بارەی قارەمان صدام حسين ەوە بیستووتە.. بڕوات بێ ئەوەندە گەلەکەمان صدام حسين یان خۆش دەوێ هەر ماڵێك هەر خێزانێك لەگشت سات و وەختێك دا چاوەڕێی هاتنی ئەو دڵسۆزە دەکەن کە بێت و لە ماڵەکەیان دا سەرلێیان بدات.. چونکە بەردەوام شتی وا ڕوویداوە و لە پڕێك دا سەر لە خێزانێك دەدات یان نانی نیوەڕۆ یان چێشتی ئێوارە لەگەڵیان دا دەخوات و کاتێکی کامەران لەگەڵیا دەبەنەسەر و ئەو گیر وگرفتانەی کە هەیانە بۆی باس دەکەن و بەوپەڕی خۆشحاڵیەوە بۆیان چارەسەر دەکات ئەمە نەك لە کاتی ئاسایی دا و بەس بگرە لە کاتی گەرمەی** شەڕەکەدا، دەچووە خوارووی عیراق لەسەر سنوورو لەنێو جەرگەی دووکەڵی جەنگەکەدا لەوێ بەشداریی دەکردو ئەنجا یەکسەر ڕووی دەکردە خێزانێکی بەختەوەر دەڵێم بەختەوەر چونکە عیراقی یەکان خۆیان بە بەختەوەر دەزانن کە دڵسۆزو ڕۆڵەکەیان سەرلێیان بدات وەتمان: ڕووی دەکردە ماڵی خێزانێك لە کوێ لە یەکێ لە پارێزگاکانی سەرووی وڵات.. دەگەڕێتەوە بۆ بەغدا، بێ وەستان لەگەڵ سەرکردایەتی سوپا، یان لەگەڵ وەزیران دا کۆدەبێتەوەو گوێ لە کاروبارەکانی تری نیشتمان، یان ژیانی عیراقی یەکان دەگرێت و ئامۆژگاریی بەنرخەکانی پێشکەشیان دەکات، کابرای بێگانە. ڕووی گەشایەوەو پێکەنی و ئەنجا دەستمی گوشی و وتی: کەوابێ هەقمە ئێستا پێت بڵێم: **خۆزگەم بە خۆتان.. پیرۆزبایت لێ دەکەم و سەرکەوتنی بەردەوام بۆتان دەخوازم**



# ٨-٨-١٩٨٨

# رۆژی سەرکەوتن و ئاشتی یە

● دلشاد أیوب سعید ●

بەو شەرە دوژمنکاری یەی کە رژیمی ئیرانی لە چواری ئەیلولی سالی ١٩٨٠ دژ بە عیراقی خوشەویستمان هەلی‌گیرساند. کە هەشت سالی خەیاند. عیراقی خوشەویستمان وبە سەرکردایەتی سەرکردەی لی‌هاتوومان سەرۆکی فەرماندە صدام حسین خوابیپاریزیت بو بەرگری کردن لە سەربەستی و لە ئاوو خاکەکەی ناچاربوو بەرامبەری دەست دریژی یەی ئیران رابوەستی و وەلامی بداتەوەو دەستی دلیرانەی لی بووەشینی و سەرکەوتن بەدوای سەرکەوتن دا وەدەست بهینیت و پشتی دەست دریژی کاری‌ی شکاندو بەزینی تووشی ئیران کرد. ئەمەش تەرازووی ستراتیژی و رامیاری‌ی عیراقی سەنگین تر کرد. لەگەل ئەوەش دا ئەم سەرکەوتنانە هیچ لە هەلویستی بیروباوەریانەی عیراق نەگوری سەبارەت بە پیویستی کوتایی هینانی جەنگ وچارەسەر کردنی ناکوکی یەکە بە شیوەیەکی ئاشتی و لەژیر تیشکی بەیاننامەی ژمارە ٥٩٨ ی ئەنجومەنی ئاسایش نیودەولەتی دا کە لە ٢٠ی تەموزی سالی ١٩٨٧دا دەری کردوە.

بەلی هەرچەندە عیراقي تیکوشەرمان روژ بە روژ سەرکەوتنی گەورەی وەدی‌دەهینا لەم جەنگە بەلام ئاشتی هیووا ئامانجە سەرەکی بووە. عیراق لە پیناوی ئاشتی و بو گیرانەوەی ئاشتی بو ناوچەکەو بو نیوان عیراق و ئیران تی کوشاوەو لەپیناوی ئاشتی دا داستانی ئەمروگەورە توماری کردوە. ئەوەش لەو نامەیەی بەریز سەروکی فەرماندە صدام حسین دەرکەوت کە بەریزی روژی شەممەی ریکەوتی

١٩٨٨/٨/٦ «پێش دووڕۆژ بەقەبول کردنی بڕیاری ٥٩٨ی ئەنجومەنی ئاسایشی نێو دەلەتان لەلایەن ئێرانەوە بە ناچاری» کە ئاراستەی گەلی مەزنی عیراق و نەتەوەی عەرەب و ئاشتی‌خوازانی جیهانی کردو ئەوەی دووپات کردەوە کە عیراق لە پێناوی گێرانەوەی ئاشتی و ڕاگرتن جەنگی نێوان عیراق و ئێران ئامادەیی خۆی نیشان دەدات تەقەکردن رابگرێت بەمەرجێك لایەنی ئێرانی قایل بێت لەگەڵ عیراق دا ووتووێژ ی ڕاستەوخۆو ڕووبەڕوو بکات ئەویش بەو مەبەستەی کە بە شێوەیەکی ڕاست و دروست و بەرێگاو کاتێکی کورت تر برگەکانی بڕیاری ژمارە ٥٩٨ی ئەنجومەنی ئاسایشی نێو دەوڵەتی کە لە ٢٠ی تەمووزی سالی ١٩٨٧دا دەری‌کردوە جێ بەجێ بکرێت و بەنیاز پاکی و ئارەزوومەندی ئاشتی‌یەکی ڕاستەقینەو بەردەوام بۆ نێوان عیراق و ئێران بگەڕێتەوەو گەلانی هەردوو لاو گەلانی ناوچەکە لە ئاشتیا بژین.

لەووتە بەنرخانەی بەڕێز سەرۆکی فەرماندە صدام حسین خوابیپارێزێت لەنامەکەی‌دا کە ئاراستەی گەلی مەزنی عیراق و نەتەوەی عەرەب و ئاشتیخوازانی جیهانی کردوە لە ١٩٨٨/٨/٦دا وتی:

«ئێمە لە دروشمی ئاشتی و بۆچوونەکانی و ئارەزووکردنی بەدی‌هێنانی رۆژ لەدوای رۆژ و مانگ لە دوای مانگ و ساڵ لەدوای ساڵ نەجماوین وەك دووپات کردنەوەیەکی لایەنێکی بنەڕەتی لە بۆچوونەکانمان لە ژیان دا کە تەماشای جەنگ دەکات وەك چۆن پتر لەبۆنەیەك دا گرتوومانە کە حاڵەتێکی ناچارییە نەك شێوازی هەڵبژێرراو لەنێوان شتی لەباتی‌ی تری سەربەرزانەو وەك دەربڕینێکی ڕەسەن وەك ڕەسەنایەتی‌ی نەتەوەکەمان و گەلەکەمان دەربارەی لێپرسراویەتی و ڕادەی ئەوەی پێویستی پێ دەکات.

لەژێر پاڵەپەستۆو کاری سیفەت و ئامانجە بۆگەنەکانیان دا لێپرسراوا ئێرانییەکان لە ڕەت کردنەوەی بانگەوازەکانی ئاشتی و بڕیارەکان دا بە ردەوام بوون کە لە لایەن نێو دەوڵەتی و ناوچەیی‌یەکانەوە دەرچووبوون هەر لە ڕەت کردنەوەی بڕیاری ئەنجومەنی ئاسایشەوە بگرە لە ٢٨ی ئەیلولی ساڵی ١٩٨٠دا تا دەگاتە بڕیاری ئەنجومەنی ئاسایشی ژمارە ٥٩٨ کە لە ٢٠ی تەموزی ساڵی ١٩٨٧ دا دەرچوو کەچی عیراق هەموو بڕیارە ناوچەیی و نێو دەوڵەتییەکانی قەبوڵ کردووە کە بۆوەدی‌هێنانی ئاشتی دەرچوون چی ئەو کاتەی عیراق لەخاکی ئێران دا بوو یان چی ئەو کاتەی لەسەر سنور دەچەنگاو ئەزەیەت دانی لەگەڵ و نەتەوەو شتە پیرۆزەکان دووردەخستەوە»

ئەم وتە بە نرخانەی بەڕێز سەرۆکی فەرماندە صدام حسین ئەوەی دووپات کردۆتەوە کە عیراق ئامادەیە کە دەستی دۆستایەتی و لێ بووردن بۆ گەلانی ئێران درێژ دەکات بەو چەشنەی کە یەزدان و بیروبارەری ئاسمان ڕێیان بۆداناوە. بەم جۆرە عیراق بە بازووی ڕۆڵە دلێرەکانی هێزە چەکدارەکان و بە هوشمەندەیی و سەرکردایەتی سەرۆکی فەرماندە صدام حسین توانی هەموو هێرشەکانی ئەم ڕژیمە پوچ بکات و هەموو خەون و خەیاڵەکانیان بە درێژایی ئەو هەشت ساڵە پووچەڵ بکاتەوە تا ئەو ڕادەیە بارودۆخی ناوخۆو بەرەی جەنگیان گەیشتە ڕادەیەکی شڕوهور کە ناچاری کردن پاش یەك ساڵی تەواو بەسەر دەرچوونی بڕیاری ژمارە ٥٩٨ی ئەنجومەنی ئاسایشی نێو دەوڵەتی دا ڕای بگەیەنن کە بە بڕیارەکە قەبوڵ بکەن بۆ گێرانەوەی ئاشتی و کۆتایی پێ هاتنی جەنگ لە ١٩٨٨/٨/٨

بەڵێ: پاش ساڵێك لە دەرچوونی بڕیاری ژمارە ٥٩٨ی ئەنجومەنی ئاسایشی‌وە پاشی ئەو هەموو زیان و سەرشۆڕی و تێك چوونی بارودۆخی ناوخۆو بەرەی جەنگیان بە ناچاری قایل بوونی خۆیان بەم بڕیارە لە ٨/٨/ ٩٨٨ ئاشکرا کرد. لەم ڕۆژەدا تەقەراگیراو کۆتایی بەجەنگ هاتەوە بەم جورە عیراق بەسەرکردایەتی سەرۆکی فەرماندە صدام حسین خوا بیپارێزێت سەرکەوت و ئاشتی وەدی‌هێنا بۆیە ئێرەدا دەڵێین... ڕۆژی ١٩٨٨/٨/٨ ڕۆژێکی پیرۆزە لەژیانی گەلی عیراق ونەتەوەی عەرەبدا چونکە لەم ڕۆژەدا عیراق کۆتایی بە درندەترین جەنگ هێناو ئاشتی هێنایەکایەوە ئەو جەنگە کە ٨ ساڵی خەیاند تیایا عیراق داستانی مەزنی تۆمار کرد. ڕۆژی ١٩٨٨/٨/٨ دەسکەوتێکی هەرە گرنگی شۆڕشی ١٧ ـ ٣٠ تەمموزە بە سەرکردایەتی سەرۆکی فەرماندە صدام حسین بۆ گەلی عیراقی خۆشەویستمان کە بە تێکۆشان و خەبات و قوربانی‌دانی گەلی عیراقەوە هاتەکایەوە.. ئەم ڕۆژە هەنگاوێکە لەسەر ڕێگای ئاشتیەکی فراوان و بەردەوام لە نێوان عیراق و ئێران دا



**١٩٨٨-٨-٨**

# ڕۆژی سەرکەوتنی مەزنی عێراقە

سميرة محمد علي

عیـراقی صدام حسین بە درێـژایی هەشت ساڵ دژی پیسترین وچە پەلترین دوژمن جەنگا ئەویش فارسی دوژمن بوو. بەم ماوەیـەدا جەنگـاوەرانی عیـراق جوانترین داستـانی قارەمـانیـەتییـان تۆمـارکـرد، لە جەنگێکی پیـرۆز، جەنگی قادسیـەی صدام کەبـە جەنگێکی شارستـانی و ئابـووری و نەتـەوەیی و راگـەیـانـدن دەژمێـردرێت، بەرهـەلستی فارسی دوژمنیـان کردووەو رووبـەروویـان بوونەتەوە، نەیانهێشتووە ئالای عیـراق دانـەوی. . بە درێـژایی هەشت سالی جەنـگ هەمیشـە سـەربـەرزی و کەرامـەتیـان پارێـزرابـوو، چونکـە جەنگـاوەرانی عیراق بەو پەڕی ئازایەتی و بەجەرگی یەوە تواناو هێزیان بۆ ئەم جەنگە دانابوو.

بەرگـری کـردنـی گەلـی عیـراقـی مەزنـمـان لە رووبـەرووبـوونـەوەی دەست درێژکاری ئێرانی درندە تەنها بەرگـری نەبـوو لە سەر خاکی عیـزاق وسنوورو سـەروەری، هەروەهـا ئامانجی تەنها ئاسایش و هێمنی ناوچەی کەنداوی عەرەبی نـەبـووو پاراستنی بـوونی نـەتـەوەیی عەرەبی، بەلکـو کارێکی پایـەبـەرزی مرۆڤـایـەتی کرد، هەروەکـو سەرەکی فەرمـانـدە صدام حسین (خـوا بیپـارێزیت) کاتێك مەدالیای شەرەفی زێـڕینی وەرگـرت کەوا رێکخـراوی پێشکـەوتنی جیهـانی بڕیاری دا بیبەخشی ئەویش بۆ رێزلێنانی هەلوێستی عیراق ودەست پێشکەری سەر کردەی لێ هاتوو صدام حسین بۆ ئاشتی و هەوڵ و کۆششی لەم بوارەدا بۆ هێنانەکایەوەی دا . .

بە دێـژایـی هەشـت سالـی جەنـگـی دادوەری و بەرگـری کـردنمـان، جەنگی قـادسیـەی صدام ی پیـرۆز. . عیراق بەسایەی سەرکردایەتی و بە گەل و رۆلە جەنگاوەرەکانی کەوا لە هەمـوو مەیـدانێـك لە مەیـدانـەکـانی جەنگ دا دژی دەست درێژکارە فراوانکەرەکان دیار بوو.



ئەوەی دووپـاتکـردەوە کەوا بە ئاواتی جەنـگ نەبـووو هەرگیز هەولی بۆ نەدا بوو، هەروەها ئیرادەتی ئاشتی هەمیشە لە هەمـوو ئاوات و ئامـانجـەکـانـدا بەهێزترەو پێشتر دەکەوێ کەوا عیراق و ڕۆڵەکانی چاوەڕێ ئەنجامەکانی دەکەن ئەوەبوو لە ڕۆژی ٨/٨/١٩٨٨ ئێران ڕازی‌بوو بە بڕیاری ئەنجومەنی ئاسـایشی دەوڵەتی ژمارە(٥٩٨) ئەم ڕۆژە، ڕۆژی سەرکەوتن بوو بۆ عیراق، ئێران قبوولی کرد شەڕ بوەستێنێت بەڵێ دەنگی ئاشتی هەمیشە بەهێزترە ئەوەبوو

لەڕۆژی ٢٠/٨/١٩٨٨ واتـە لە هەمان ساڵدا ئەنجومەنی ئاسـایشی دەوڵـەتی بڕیاری دا بە ڕەسمی تەقەبوەستێت لە نێو هەردوولا عیـراق و ئێـران، خۆشـی‌یـەکی گەورە بوو بۆ سەرکـردایـەتی‌و بۆ گەل و نەتـەوەی عەرەبیمـان هەرچـەنـدە دیـاربـوو عیـراق تاچ ڕادەیـەك سەرکـەوتنی لە هەمـوو مەیـدانـەکـانی جەنـگ دا وەدەست هێنـاوە هێزی ئێرانیش بە تەواوەتی ڕوخا.

هەروەهـا عیـراقی مەزنیش ئەوەی دووپـات کردەوە کەوا ناچـاربـوو ڕووبـەرووی دەست درێـژکـاری ئێرانی دوژمن ببێتـەوە، کاتێـك گەیشتـە تینی‌و بە هیـچ زمـانێـك تێ نـەدەگـەیشت و هەمـوو ڕێگـایـەکی ئاشتی پشت گوێ خستبـوو، کەللەڕەقی‌و فیـززلی ڕژێمی ئێـرانی ئەم جەنگەی هەڵ گیرساند، بایەخی نەدا بە گەلانی ئێران و لە ناوخوێن دا گەوزایـانی، حـوکم دارانی خوێنـڕێـژی ئێران دەنگی ئاشتی بەلایـانـەوە دەتـووت بایـەکـە وبـەلای گوێ‌یـان دەڕوات دەیـانـویست عیـراق بدەنـە پاڵ ئیمپـراتـوریەتە خەیالاوی‌یە کەیان دا، کە بوونی بۆ نەبووەو نی‌یە.

عیـراقی مەزن بەم سەرکـەوتنە مەزنەی بە سەر ئێران و ئەو قوربـانیـەی ڕۆڵـەکـانی پێشکەشیان کرد لە هەموو جیهان دا دەنگی‌دایـەوە، بۆ هەمـوو کومـەڵەی دەوڵەتی دەرکەوت کەوا عیـراق بۆ ئاشتی جیهـان و ئەمن و ئاسـایش سەرکەوت پاش ئەوەی ڕژێمی تەلـەکـەبـازی ئێـرانی بوی دەرکـەوت کەوا بەردەوام بوونی لەم جەنگـەخوێناوی‌یە سوودی نی‌یە بۆیان و دەستـە پاچـەوەستـاون بەرامبـەر بە هێـزی سوپـایی عیـراقی وگەیشتە حاڵەتی ئیستنزاف و ئامێری سوپایی ئێرانی شکاو لە نوشوستی زیاتر هیچی دەست ناکەوێت.

٨/٨ بە ڕاستی گۆرانێکی گەورە بوو لەم جەنگە بە ڕۆژی سەربـەرزی بوو بۆ گەلی عیـراق، کۆتـایی بە جەنگ هێنرا، کۆتـایی بە کوشتن و کوشتـاری هێنرا هەرچەند ڕژێمی ئێرانی تائێستـا وتـوێـژی نێو هەردوولا درێژەپی‌دەدات بەلام ناتوانی جارێکی‌تـر جەنگ هەلگیرسێنێت و هەمیشە بەشی پەشیمانی دەبێت.



# سەختیی

**رەمەزان فەتاح**

دوو بەیانی پێنج شەممەیە. . ڕۆژێکی دیاری‌و پڕ لە کامەرانیی ژیانمە. ئەی چۆن بەختیارو شادمان نابم؟ . . دوو بەیانی بە ئاواتی چەند ساڵەم دەگەم. بووکە جوانەکەم بۆ دەگوێزنەوە. . (شلێر)ی ناسك و نازدار دەبێت بە هاوبەشی ژیانم. ئای خودایە گیان لێت بەریادبێت . . چوار دانە ساڵە. چوار ساڵی ڕەبەقە، من و شلێر چاوەڕێی ڕۆژێکی وادەکەین. دووبەیانی. . دوو بەیانی، ئای لەم دوو وشە پڕ تام و بۆیە. . ئەم دوو وشەیە لە هەست و هۆشی‌من دا لە گوڵ بۆن خۆشتری لە هەنگوین و شەکراو شیرین ترن، لە نوقڵ و نەبات بەتامترن. توخودا لێم مەگرن. . خۆیشم دەزانم لە خۆشی‌دا قسەی منداڵانە دەکەم! بەڵام ئەگەر ئێوە لە دەردو ئازاری دڵداری شارەزابن ئەوکاتە پێم دەڵێن: «کاکە سالار، بەڕاستی ئەگەر ئێستا لە خۆشیی ڕۆژی پێنج شەممەدا، وەکو منداڵیش بکەویتە گڕوگاڵ، هێشتا ناهەقت نی‌یە.»

ئای کە باوکی شلێر گیان پیاوێکی دڵڕەق و قیرسیچمەیە بەهەقی قورئان دنیام لێ کرد بە ڕجاکار، هەر کەڵکی نەبوو. هەموو بیانووەکەیشی ئەوەبوو، بە خەڵکەکەی دەوت: «باوکم تا ماڵ وەستابێت، مزگەوت حەرامە. . من شلێری‌کچم بۆ بەختیاری برازام

داناوە». مام (قادر)ی بەڕێز وا دەزانێت ژن و ژن خوازیش، وەکو میراتی.. دەبێت بۆ کەسوکار بێت! بەڵام پیاو هەق بڵێت.. ئەو ڕۆژەی کەپێیان وت: (سالار)ی دراوسێتان لە شەڕی ئەمجارەدا سەربازێکی برینداری عێراقیی لە دەست دوو سەربازی ئێرانی ڕزگار کردووەو، هەردوو ئێرانیەکەشی کوشتووە. سەرانسەر هەڵویستی خۆی گۆڕیووەو وتوویتی: لەبەر ئەوەی سالار سەربازێکی ئەوەندە ئازایەو، وادڵ سۆزانە لە پێناوی خاکی نیشتمانمان دا دەجەنگێت.. ئەوا منیش شلێرم پێبەخشی.

کاکە، کە ئەو هەواڵەیان دامێ.. لە خۆشیدا پێم بەزەوی نەدەکەوت. باوکم و مامم و هەردوو خاڵەکەم... ئا، لەبیرم کەوتەوە.. پوورە ئاسکەشمان لەگەڵ دابوو.. هەموومان بەپەلە ڕۆیشتین بۆ ماڵی مام قادر گیان. باوەڕ بکەن دەجار پتر هەردوو دەستیم ماچ کرد. ئای پیاو لەم دنیایەدا هەر سەبروو ئارامی ببێت و کوڵ نەدات.. بەهەموو ئاواتێکی خۆی دەگات. لە ئەم ڕۆژەوە پشووی دەرۆژم وەرگرتووە. کەلوپەلم کۆ کردۆتەوە.. هەر ئەووم ماوە ماڵ ئاوایی لەبرادەرە سەربازەکانم و، نەقیب (سەلام) بکەم.. بەڕاستی نەقیب سەلام، سەرەڕای ئەوەی گەورەو کاربەدەستمانە.. وەکو برایێکی دایك و باوکیشمانە. دوێنێ کە بۆ مەسەلەی پشوو وەرگرتنەکەم چوومە لای.. بەزەردەخەنەیێکی شیرینەوە پێی وتم: زاوا، پیشەکی پیرۆز بامبێت لێ بێت.. ئومێدەوارم خێزانێکی بەختیار پێکەوە بنێیت.

ئالەوکاتەدا وەکو منداڵێکی شەرمن ڕوومەتەکانم سوور هەڵ گەڕا. قەستم بوو لە خۆشیدا دەست لە ملی نەقیب سەلام بکەم و، تیر ئەمەلاو ئەولای ماچ بکەم. ئەوا عەریف حەسەنیش بەرەو سەنگەرەکەی من هات. یاخودا خێر بێت.. دەبینم ناوچەوانی بەیەك دا داوە.. خوانەخواستە دەبێت شتێك ڕووی دابێت؟.. کورە باوەڕ ناکەم هیچ ڕووی دابێت. عەریف حەسەن تاڵیی شارەزا نەبێت، دوور بە دوور وادەزانێت هەمیشە دۆی ڕژاوە.. بەڵام کەڵێی نزیك دەبێتەوەو، لەگەڵیدا دادەنیشیت و، وتووێژی لەگەڵ دەکەیت.. دەڵێیت: ئەمە هەرگیز ئەو عەریف حەسەنە مڕو مۆنە نی‌یە. هەر بەقسەی خۆش و نوکتەو ڕەفتاری شیرینی، وات لێدەکات.. لە برایێکی خۆت خۆشترت بوێت.

- عەریفی بەخێر بێیت.

- هەربژیت کاکە سالار... براکەم تۆ خواحافیزت بێت.. برۆرەوە بۆ ماڵەوە، ژنی خۆت بگوێزەرەوە منیش، دەبێت عەددەد ڕەشاشێکی وەکو خۆت ئازا بخەمە جێگاکەت. ئێستا هەواڵمان بۆهات.. نیوەشەوی داهاتوو، خومەینی‌یە نەفامەکان، هێرش دەهێننە سەرمان.

کە ئەم هەواڵەم بیست.. هەموو دەمارەکانی لەشم گرژ بوون. سەرم سووڕی خوارد. کەوتمە مل ملانێ یێکی دەروونی توندو تیژەوە...

لە لاییکەوە هەموو شتێك ئامادە کراوە بەو شێوەیەی کە دوو بەیانی بووکم بۆ دەگوێزنەوە. لە ئەم ڕۆوە دەبێت لەماڵەوە ئامادە بم، پشوو نامەکەشم ئەوەتا لە تەنکەی باخەڵم دایە.. خۆیشم ئەوەندە ئارەزووی ڕۆیشتنەوەم هەیە کات و سات بەپەنجە دەژمێرم.

لە لایێکی دیکەوە، بەلامەوە کارێکی نەکردەنی‌و ستەمە.. هاوڕێکانم لە پەرەی شەڕدا بەجێیان بێڵم. ئەمان لە دژی ئێرانی‌یە شەڕ فرۆشەکان بجەنگێن و، لێیان بکوژرێ‌و، بریندار بکرێ.. منیش لە ماڵەوە سەرگەرمی شایی‌و ژن هێنان بم: «نانا، هەرگیز پشت لە برادەرەکانم و، بەرەی جەنگ ناکەم.. هەرگیز پشت لە نیشتمانە خۆشە ویستەکەم ناکەم. شلێرم چەند خۆش بوێت... لەگەڵ ئەوەش دا ولاتەکەمم خۆشتر دەوێت.» بەدەستێکی ساردو سڕەوە.. پشوو نامەکەم لە گیرفانم دەرهێناو، لەبەردەمی عەریف حەسن دا دام‌نا. بەواق وڕمانێکەوە پرسی:

- ئەوە چی‌یە؟! مەبەستت چی‌یە؟

- نارۆمەوە.. لەم شەڕەدا لەگەڵتان دەبم.

- کوڕم ئێستا لە ماڵەوە چاوەڕێت دەکەن.. ئەی وابڕیار نی‌یە پێنج شەممە شلێرت بۆ بگوێزنەوە؟

- نامەیێکیان بۆ دەنووسم، داوای لێ بووردنیان لێ دەکەم. ئەگەر لەم شەڕەدا بێ‌وەی بووم، ئەوا لەدوایی‌دا شلێر دەگوێزمەوە.. خۆ ئەگەر کوژرام، ئەوا منیش وەکو لاوەکانی دیکە بەسەربەرزی‌یەوە بەقوربانی خاکی عێراق دەبم.

•

عەریف حەسەن، باوەشی بۆ سالار کردەوە.. لەگەڵ ماچ کردنی ناوچەوانی‌دا، فرمێسکی هەردووکیان تێکەڵ بەیەك بوو.

* * *

لە ڕۆژی پێنج شەممەدا تەکسی‌یێك بە تەرمەکەی سالارەوە، بەخێرایی بەرەو ماڵیان دەکشا

# هونەرمەندو

# شاهیدی سەردەم

● محمد فريق حسن ●

نووسەرو هونەرمەند شاهیدی سەردەمی خۆیانن!! . . گەلێجاران لەسەر زاری رەخنەگرانی لای خۆمانەوە . . لەکۆڕو کۆمەڵدا بێ یاخود لەسەر لاپەڕەی ڕۆژنامەو گۆڤارەکان، ئەو وتەیەی لای سەرەوە دووبارە دەبێتەوە . . وای لێهاتووە «نووسەرو هونەرمەند شاهیدی سەردەمن» بۆتە ئیدیۆمێك و کەوتۆتە سەر زمانی ئەدەب دۆستان و هەندێ کەس وەك پاڵپشت بۆ بەهێزکردنی ڕاوبۆچوونەکانیان لەوەخت و ناوەختا پەنای بۆدەبەن . .

لەم کورتە وتارەدا بەنیازم ئەو ئیدیۆمە ڕەت بکەمەوە . چونکە بەلای منەوە جێگاو ڕێگای هونەرمەندو نووسەر لەوە زیاتر و بالاترە بە «شایەتی سەردەم» قایل بن و پالی لێبدەنەوە . . ئەمە چ وەك دووبارە کردنەوەی دیاردەو دیمەن و ڕووداوەکانی سروشت و دەوروبەر لە شیعر و چیرۆك و تابلۆکانیان دا، یاخود وەك هەلوێست وەرگرتن بەرامبەر بەو دیاردەو دیمەن و ڕووداوانە .

ئەگەر هونەرمەند شاهیدی سەردەم بێ، ئەوا لەو گۆمە مەنگانە دەچێ کە بوونەتە ئاوێنەو وێنەی گاشەبەردو باڵندەکانی کەناری و درەخت و لەڤەن عەکس دەکەنەوە . . هەرچی شاعیرە، بەو وێنە ڕاوەستاوانەی دەوروبەری ناقایلە، بۆیە دەچێ پەل بەلایەکی دیکەدا دەهاوێ و پەنا بۆ خوازە، درکەو لێکچواندن دەبات تاکو وێنەی نوێ بەرپا بکات و بیهێنێتە وجوودەوە . ئەم کارەی شاعیر لەخۆیدا یاخی بوونە لەو دیمەن و وێنە ڕاوەستاوانەی کە لەواقیعدا هەن، نەك عەکس کردنەوەیان . . باشەویش بڵێین، زۆر کەرەت شاهید ئاگای لە توێکڵ ودیوی دەرەوەی ڕووداوەکانە . واتە ئاگای لە ئەنجامەو بێ ئاگایە لە هۆیەکان . ئەو هۆیانەی کە ئەنجام دەخەنەوە . . ئاگای لە کەفچەڕێنی ڕووبارەکەیە، بەلام ئاگاداری تەوژمە بەهێزەکانی ناوەوەی نی‌یە . بێ ئاگایە لە ملانێ و دژایەتی دیوی ناوەوە لە جووڵەو بەرەو پێشەوە چوون . . دیارە لەم حالەدا نابێتە شاهیدێکی هوشیارو ناتوانێ سەردەم عەکس بکاتەوە . . هونەرمەند ئاوێنەی تایبەتی خۆی هەیە بۆ عەکس کردنەوەی جیهان . سیزان دەڵێ: «هەرچی لە سروشتدایە بریتی‌یە لە وێنەی لوولەك و گۆو ڕەحەتی»

هونەرمەند لە دەوروبەری خۆیدا دەژی و کاردەکاتە سەر کۆمەڵ و کۆمەڵیش کار لەودەکات . نایەت ڕووداوو بە سەرهاتەکان وەك سەربوردە بگێڕێتەوە . . وەك خۆیان بیانهێنێ و جارێکی دیکە تابلۆو ڕۆمان و شیعریان لێ بڕسکێنێ . . نەخێر، ئەو ئاوات و ئارەزووی خۆی تێکەڵ دەکات . بەلای چاکەی خۆیدا بە سەرهاتەکان دەشکێنێتەوەو ڕامیان دەکات . ئیتر لەم حالەدا نابێت بە شاهید . چونکە ئەو جیهانەی لە ڕۆمان یاخود لە تابلۆیەکدا بەدی دەکرێ جیهانێکی تایبەتەو خەیاڵی خۆی ئامێتە کردووە . . ئەگەر وەهانەکات کارەکەی دەبێتەوە بە فۆتۆکۆپی و لە هونەر دەردەچێ . . ئەم کارە لەم سەردەمەدا «فۆتۆگراف» گرتوویەتیە ئەستۆی خۆی . ئێمە لێرەدا مەبەستمان لەوە نی‌یە کە هونەر بە گشتی لەواقیع دابڕین . . نەخێر . . چونکە هونەرمەند هەرچەندە بە شاباڵی خەیاڵ بەرز بفرێ، ئەنجام هەردەبێ لە فرگەی واقیع بنیشێتەوە . . مەبەستمان ئەوە نی‌یە بڵێین هونەر بریتی‌یە لە خەیاڵی ڕووت . . لەم حاڵەتەدا شاهیدی وریاو زیرەك چاکترە لە خەیالبازی بێ بناغەو سەنتەر . . خەیاڵی نەزۆك و دوور لە ژیان و ژیاری مرۆڤ . «هونەرمەند حیکایەتخوان نی‌یە بە زنجیرە ڕووداوەکان بۆ گوێگر بگێڕێتەوە، یاخود ڕیکۆردەرێ بێ چیت گوت ئەوەی . لەسەر تۆمار

بیێ. . ئەو، ئاوێنە نی‌یە کۆمەڵ عەکس بکاتەوە. . هونەرمەند لە ڕووداوەکان زیاد دەکات. . لێیان دەقرتێنێ. . پەرەیان پێ‌دەدات. . ڕەنگە لەو پەرەپێدانەدا زۆربەی کۆمەڵیشی لەگەڵ نەبێ. . چونکە ئەوان پێی ڕانەهاتوون و بەوە ڕاهاتوون کە لەوەوبەر ئالوودەی بوون و لە گۆڕانکاری سڵ دەکەنەوە. پێویستە چاك ئەوە بزانین کە هەردەم ڕای هونەرمەند کەم و زۆر پێچەوانەی ڕاوبۆچوونی سەردەمەو پێچەوانەی دیدو بۆچوونی باوە»

کۆتر، بۆ گۆشتەکەی یاخود لەبەر گمەو جوانی‌یەکەی ڕادەگیرێ. . ئەسپ، بۆ سواری‌و بارکێشانە. . ئاگر، بۆ خۆگەرم کردنەوەو چێشت لێنانە. .

ئەمە لەژیانی ڕۆژانەداو لەبارودۆخی ئاساییدا. . کەچی هەر ئەمانە لە تابلۆی هونەرمەندێکدا مانای لەوانە گەورەتر. لە خۆیاندا هەڵدەگرن. . ماناو هێمای گەلێ جیاواز لەوەی لەژیانی ئاساییدا هەیانە. . هونەرمەند دەتوانێ گیانێکی دیکە بکاتە بەر کۆتر و ئاگر و ئەسپ. . پابلۆپیکاسۆ، لە تابلۆی جێرنیکاو کەلێکی دیکەدا «گا»ی وەك ڕەمزی تووڕەبوونی شەیتانی، دژ بەمرۆڤ بەکار هێناوە. . ئەو کە منالی‌ی ئیسپانیایە، دیارە لەوێ چۆتە دیدەنی‌ی «مصارعة الثیران»و بینیویتی چۆن گا، کاتێ بە چارۆکە سووره تووڕەدەکرێ، بێ‌ئامان شاڵاو دەباو دەبێتە دوژمنێکی ترسناك و قەستێتی هەرکەسێ لە گۆڕەپانی شەڕەگاکەدایە بە شۆق ورگی بدڕێ. . دەسا پیکاسۆ لەناو خاسیەتەکانی ئەم ئاژەڵەدا هاتووە ئەم لایەنەی بۆ تابلۆکانی بەگەن کردووە. . نووسەر و هونەرمەند بریتی نین لەتەنیا دوو چاوی زەقی کامێرا ئاساو وێنەی بێ‌گیانی کۆمەڵگا بگرن. . ئەی ئەوانیش وەکو ئەو خەڵکە لەژیاندا تووشی چورتم و دەردی‌سەری نایەن؟!. . ئەی ئەوانیش خاوەنی هەست ونەستی خۆیان نین و بیرناکەنەوە؟!. . ئەگەر هەموو لایەك هەر بینەر بن ئەوا کۆمەڵ لەجێی خۆی چەق دەبەستێ‌و گۆڕان و پێشکەوتن ڕوونادات!. . نەخێر، هونەرمەند بوونەوەرێکی بێ‌گیان نی‌یە تاکو ڕرداوەکان بەبێ ئەو یاخود دوور لەو ڕووبدەن! مەسەلەی شایەت و شایەتکاری دانەپاڵ نووسەر و هونەرمەند لەوەدەچێ وتەیەکی وجوودیانە بێ تاکو لە بەشداری‌کردنی کێشەکان دووریان بخاتەوەو وابکات لەکونی کلیلەوە سەرنجی ڕووداوەکان بدەن. . ئەی کەوایە، بۆچی شاعیرانی وەك گۆران و کامەران و، نەك هەر بەشداری‌یان لە مەسەلە گرنگەکانی سەردەمی خۆیاندا کردووەو شیعریان بۆ گوتوو. . بەڵکو سەرباری کێشەی لای خۆیان، ڕایان لەسەر مەسەلەی میللەتانی دیکەش دەربڕیوەو سەرباری زامی میللەتی خۆیان، بوونەتە برین پێچی گەلی کۆریاو جەزائیر؟!. .

شاهید بێ‌لایەنە ڕووداو وەك خۆی دەخاتە پێش چاو. . کەچی نووسەر و هونەرمەند ڕاوبۆچوونی خۆیانی تێکەڵ دەکەن. خۆ ئەگەر بێتو تەنیا ڕووداوەکان کۆپی بکەن، ئەوا نابنە هونەرمەند، بەڵکو دەبنە مێژوونووس. دیارە جیاوازی زۆرە لەنێوان ئەرکی هونەرمەندو مێژوونووس دا. .

لەم کورتە وتارەدا، هەوڵ دەدەین بەپێی توانا لە وردەکاری‌و داهێنانی تابلۆی جێرنیکای هونەرمەند پابلۆ پیکاسۆ بلوێین، ئەوەندەی پەیوەندی بە باسەکەمانەوە هەبێ، تاکو بزانین ئەو چۆن سەرنجی ڕووداوەکانی سەردەمی خۆی داوەو چۆن لە تابلۆکانیدا بەرپای کردوون؟. .

کاتێ لە ساڵی (١٩٣٦)دا، فڕۆکەکانی ئەڵمانیا هاتنە کۆمەکی ژانراڵ فرانکۆو بۆماوەی سێ سەعات ونیو بۆردومانی شاری جێرنیکایان کرد، خەڵکی تاکو ئەو کاتەیش زیانی سەروماڵی‌ی وەها گەورەیان نەدیبوو، کە بریتی‌بوو لە تەخت کردنی شاری جێرنیکا لەگەڵ زەوی کوژرانی دووهەزار ژن و منال و پیر. . ئەو کارەساتە دنیای هەژاند. . بەڵام پیکاسۆی پاریس نشین کە خۆی هەم خەڵکی ئیسپانیا بوو، هەم لایەنگری کۆماری‌یەکان بوو پێشتریش گەلێ هاوکاری لەگەڵدا کردبوون، ئەم ڕووداوەی کردە تابلۆیەکی گەورەی دیوار، لە پیشانگای پاریس نیشانی‌دا. .

پیکاسۆ، هەرچەندە تابلۆکەی ناونا جێرنیکا، کەچی نە بینایەکی ڕووخاو، نە ئاگر و دووکەڵ و وێنەی فڕۆکەی لە تابلۆکەیدا کێشا. . تەنانەت بە سەرنج لە تابلۆکەدا کات وشوێن پێ‌نازانرێ کەی‌و لەکوێ کارەساتەکە ڕوویداوە؟. . ئەو هاتووە لەڕێگای ئافرەتێکی زارەترەکەوە بە هێڵی تیژو گۆشەدار. . سەری گایەکی تووڕە، وەك ڕەمز بۆ دوژمنایەتی مرۆڤ. . هەروەها لەڕێی جەنگاوەرێکەوە کە بۆتە ژێر دەست وپێوەو مردووە. . ڕووی لە ئاسمانەو مشتووی شمشێرەکەی هێشتا توند بەدەستەوەیە. . هەروەها گلۆپی کۆنی بێ ڕووناکی. . ئەسپێك کونەلووتی فش. زمانی تیژ وەك دەمی تیغەو دەحیلێنێ. . کارەساتی جێرنیکای نەخشاندووە. . تەنانەت وەك ڕەنگیش هاتووە هەموو تابلۆکەی بەڕەش و تۆنەکانی ڕەش کێشاوە. . پیکاسۆ، لەم تابلۆیەدا شاهید نی‌یە. . چونکە لە سەرنج بەشەکانیدا کەدوای نزیکەی سکێچ هاتە ئەنجام، نارەزایی‌و بێزاری‌یەکی زۆر هەست پێ‌دەکەی بەرامبەر شەڕو شەڕهەڵگیرسێن. . دڵنیام ئەگەر بهاتایەو وێنەی شارێکی سووتاوی بکێشایە، ئەو بایەخە جیهانی‌یەی نەدەبوو کە ئەمڕۆ هەیەتی‌و بەیەکێك لە شاکارەکانی سەدەی بیستەم حساب دەکرێ. .

•

تابلۆکە دەربڕینە لە کارەڕەهات و ترس لە سەرەنجامی جەنگ، بێ‌ئەوەی پارچەیەك چەکی ئەو سەردەمە پیشان بدات. . وەك هەڵوێنتیش پیکاسۆ هاتووە بەئاشکرا بێزاری‌و نارەزایی خۆی بەرامبەر فاشیەت دەربڕیوەو لایەنگیری خۆی بۆ خەڵکی جێرنیکا پیشان دەدات. . بەرەی جەنگ خواز تاوانبار دەکات. . ئەو نەبووە بە شاهید بەسەر ڕووداوەکەوە. . زیرەکانە خەڵکی ئاگادار دەکاتەوەو زەنگی مەترسی لێ‌دەدات، تاکو خەڵکەکە بەئاگابن و هوشیار بینەوە. .

لەراستیدا مەبەست لەو شاڵاوە بۆسەر شاری جێرنیکا، زیاتر تاقیکردنەوەی

ئەو چەکە نوێیانە بوو کە تازەکی لە ئەڵمانیا رەنێو هێنرابوون، دەنا لاوانی جێرنیکا لە بەرەکانی جەنگە بوون. ئەوەی لەشاردا مابوون بریتیبوون لەپیر و ئافرەت ومناڵ.. ئەوە بوو دوای چەند ساڵێك ئەڵمانیا جەنگی دووەمی بەرپاکرد.. دوای ئەو رووداوەیش بەنۆ ساڵێك لەشاری هیرۆشیما لەوە خراپتر قەوما..

گواستنەوەو لاسایی‌کردنەوەی سروشت و دەوروبەر بەبێ رتووش، بە داهێنان حساب ناکرێ لەسەر هونەر ناکرێتە ماڵ..

خۆ هونەرمەند نایەت بەهۆی کاغەزی تەنکەوە وێنەکانی دووبارە بکاتەوە ئەو لە بنیات ناندا بەشداری دەکات.. ئەو یەکێکە لە کەسە زیندووەکانی کۆمەڵ و جیهانمان بۆ لێك دەداتەوە.. بەشداری گۆڕین و گواستنەوە دەکات لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی نوێتر..

دیلاکروا دەڵێ: «سروشت لە فەرهەنگ دەچێ، دەتوانین منانای لێ‌دەربێنین. کتێب نییە تاکو بیری لێوە بگوێزینەوە.. سروشت کەرەسەی بینایەو بینا نییە..»

ئەمرۆ لەجیهاندا باوی مامەڵەکردن لەگەڵ ئەفسانەدا سەری هەڵداوەتەوە.. ئەفسانە دەکرێ بە پێخۆری رۆمان.. دەکرێ بە شیعر.. ئایا ئەفسانە درۆو دەلەسەیە؟.. نەخێر، ئەفسانە بە درۆودەلەسە حساب ناکرێ بەڵکو لێکدانەوەی سروشتە، لێکدانەوەیەك دەتوانین بڵێین زیادەرۆیی (مبالغە) تێدایە.. یاخود لێکدانەوەیە ئێمەی مرۆڤی ئەم سەدەیە پێی رانەهاتووین.. هەرچی چۆنێك بێ، ئەفسانە لێکدانەوەیەکی خەیاڵییە بۆ سروشت و دەوروبەر کەچی ناتوانین لە داهێنان مایەپووچی بکەین و رەفزی بکەین ئەگەرچی هەندێ جار لەواقیع دوورمان دەخاتەوە..

تەشکیلییەکانی ئەم سەردەمە، بۆ روخساری سێ چاو، لووتێکیش دووهەبندەی دەم وچاوەکە دەکێشن.. لەبری دووان، دێن سێ دەست بۆ مرۆڤێك دەکەن.. کەچی لەواقیعیشدا مرۆڤی سێ چاوو سێ دەستمان نەدیوە.. شاهیدیش نین بۆ سەردەم.. کێ مرۆڤی دیوە سێ چاوی هەبێ؟

کێ مرۆڤی دیوە کەپووی لەرووی گەورەتر؟!.. دوای ئەوەیش، ئەو جوانییەی لە سروشتدا هەیە مەرج کە گواستمانەوە بۆناو تابلۆ هەروا بەجوانی بمێنێتەوە.. جوانیی ناو سروشت جودایە لەجوانی ناو تابلۆ «ئەو جوانییە خۆرسکییەی کە لە مرۆڤدا هەیە پەیوەندی بە جوانیی هونەرییەوە نییە.. مەرج نییە وێنەی ئافرەتێکی شۆخ وشەنگ وەك خۆی جوان دەربچێت.. کەچی وێنەی ئافرەتێکی دزێو یاخود ئاسایی لەوانە بێتە توحفەیەکی هونەریی باڵا»[2]

گریمان لاسایی‌کردنەوەی رووتی سروشت لە هونەری پلاستیکیدا گونجاو بێ، ئەدی یەك لەباری مۆسیقا بڵێین چی؟.. دەکرێ مۆسیقازان بەسەر سروشتەوە شاهیدبێ‌و کوت ومت خوڕەی ئاو.. جریوەی مەل.. گفەی (با) مان بۆ لێداتەوە؟!.. بێ‌گومان نەء.. چونکە ئەم دەنگانە با خۆشیش بن، بەلام دەنگی سەرەتایین.. ناتوانین ئاوازی مۆسیقایان لێ پێك بهێنین. «لاسایی کردنەوەی شتەکان و سروشت لە هونەردا، کاری بنچینەیی نین، بەو بەڵگەیەی هونەری میسری کۆن زیاتر رەمزی بوون تاکو ئەوەی گواستنەوەی رووت بن»[3]

مرۆڤ لە بەرەبەیانی مێژووەوە، لە خولیای بیرکردنەوەو پشکنین و گەڕاندا بووە بۆ ئەوەی رێگایەك بدۆزێتەوە تاکو دەوروبەری پێ گونجاوتر و خۆشتر و پشکەوتووتر بکات.. ئاینی داهێناوە.. ئەفسانەی داهێناوە.. تاکو بتوانێ بەهۆیانەوە زاڵ بێ بەسەر سروشتی سەخت و نالەبارداو لەو واقیعە تاڵەی کە هەیەوە دووری بخاتەوە.. هونەرمەندیش وەك مرۆڤێکی وریاو زیندو، ئەو خولیایەی لە کەللەدایە.. دیلاکروا دەڵێ: «داهێنان تێپەڕاندنی بنەما نەگۆڕو راوەستاوەکانە لەهەستی خەڵکیدا بەگشتی.»

ئەگەر وێنەکێشانی سروشت لەسەردەمێکدا دروست و شیاوبوو بێ، ئەوانەمرۆ ئەو سەردەمە بەسەرچووە.. چونکە مرۆڤ ئەمرۆ لەسروشت حاڵیبووەو تێگەیشتووە.. مرۆڤ گەیشتە سەرمانگە و شۆڕبوتەوە بۆبنکی زەریاکان.. ئیتر سەرنج دانی گەردوون و سروشت وەك جاری جاران جێی حەپەسان و سەرسوورمان نییە.. ئەو هونەرمەندەی تەنیا سەرگەرمی وێنەکێشانی واقیعەکەیەتی‌و گەرەکێتی بە هەرنرخێك بووە بیچەسپێنێ، ئەوا زیادەرۆییمان نەکردووە ئەگەر پێی بڵێین دوورەپەرێز و سلۆك سەرنجی دەوروبەر دەدات و پرکێشی‌ناکات لەو بازنەیەی بۆ خۆی کێشاوە بچێتەدەرەوە، نەبادا ئەنجامەکەی خراپ بە سەریدا بشکێتەوە.. بۆیە هەرچەند دەکات و دەکۆشێ لەدەستی نایەت لە قاپلووخەکەی خۆی بچێتە دەرەوە.. شارل لالۆ دەڵێ:

«گواستنەوەو لاسایی‌کردنەوەی نزم بەهیچ جۆرێ ناچێتە خانەی داهێنانەوە، بەڵکو پیشەیەو (حرفە) پەیوەندیشی بە هونەرەوە نییە.»[4]

مەسەلەی بە شایەت راگرتنی هونەرمەند زیاتر لەو جەماوەرە دەچێ کە دەچنە سەیری یارییی تۆپی پێ.. هەرچەندە هاوارو قیژەقیژ بنێنەوە، هەرچەندە هانی تیپەکەی خۆیان بدەن، هێشتا لەباریاندا نییە گوڵێکی بۆ تۆمار بکەن. یاخود گۆڵێکی تیپی بەرامبەر گل بدەنەوە.. مەگەر ئەوەی تێدابێ لە نزیکەوە یارییەکەیان دیوەو چێژیان لێ‌وەرگرتووە.. کاتیان پێ بەسەر بردووە.. ئەگینا یەکلایی کردنەوەی یارییەکە لە گۆڕەپانەکەدا روودەدات نەك لەسەر پلیکانەکانەوە کە بینەر لەسەری هەڵنیشتوون. داخۆ شوێنی هونەرمەند ناو گۆڕەپانەکەیە یاخود سەر پلیکانەکان؟ یاریزانە یاخود بینەر؟

سەرچاوەکان:

(١) د. محمد النويهي. محاضرات في طبيعة الفن ومسؤولية الفنان، ١٩٥٧، ص/ ٧١ - ٧٢.

(٢) شارل لالو. مبادەی علم الجمال، ترجمة: مصطفى ماهر، ١٩٥٦، ص/١١

(٣) د. عفيف بهنسي. الثورة والفن، بغداد، ١٩٧٣، ص/١٣.

(٤) شارل لالو. مبادیء علم الجمال، ترجمة: مصطفى ماهر، ص/ ٤٩.

● لێکۆڵینەوەی شانۆگەری ●

# بزووتنەوەی شانۆگەریی کوردی لە نێوان واقیع و ئەزموونگەریدا

● مەغدید حاجی ●

- لە تشرینی یەکەمی ساڵی ١٩٨٧ دا دەستەیەك هونەرمەندی‌شانۆیی لاو لە شاری سلێمانی خۆشەویستەوە هەواڵی دامەزراندنی‌تیپی شانۆی ئەزموونگەریی کوردی‌یان ڕاگەیاند.

- لە ڕۆژی (٢٨-١٠-١٩٨٧) دا کۆڕێك بە ناوونیشانی: (شانۆی‌ئەزموونگەریی‌و دەوری لە بنیادنانی شانۆی کوردی دا) بۆهونەرمەندان (شەماڵ عومەر)و (کەریم عوسمان) لە هۆڵی‌ڕۆشنبیری جەماوەر لە هەولێر سازکراو هەمان بابەتی کۆڕەکە بەر لە پێشکەش کردنی لە هەولێر لە لایەن هەمان دوو برادەرلە سلێمانی پێشکەش کراوە.

ئێمەیش بۆ نموونەو بەڵگە چەند قسەو بۆچوونێکی ئەم دوو هونەرمەندەمان کە لە کۆڕەکەی هەولێر دەریان بڕی لەناو چەند «دووکەوانە» یەك دا لەم کورتە باسەدا هێناوەتەوەوبە هەندێ بەڵگەوە وەڵامان داونەتەوە.

- لەم یەك دوو ساڵەی دوایی‌دا بە شێوەیەکی سەرنج ڕاکێش وتا ڕادەیەك گومان لە خۆگرتوو چەند کورتە باس و وتاری ئامادەکراوو وەرگێردراو دەربارەی ئەزموونگەریی‌و شانۆی ئەزموونگەری چاخگیرانە لەسەر ڕووی گۆڤارو ڕۆژنامە کوردی‌یەکان بە تایبەتی (عێراق) خراونەتە ڕوو!!.

ئەم جۆرە دیاردەو ڕووداوانەی پەنجەمان بۆ درێژکردن وئەوەی لە میانەیان دا وتراوو خراوەتە ڕوو، بوونەتە هۆی‌سەرهەڵدانی ئەم کورتە لێکۆڵینەوەیەی ئێمە کە پتر لەشێوەی وتار دەچێت.

ئێمە لە کاتێکدا خۆشحاڵی خۆمان بەرامبەر هەر هەوڵدانێکی‌نوێ، هەر تاقی‌کردنەوەو ئەزموونێکی تازە بۆ خزمەتکردنی‌شانۆی کوردی‌و پێشخستنی بزووتنەوە گەرم و گوڕەکەی‌دەردەبڕین .. بە پێویستمان زانی چەند هەڵوێستەیەك لە بەرامبەر هەندێ لە بیروڕاو بۆچوونی ئەو هونەرمەندەبە تواناو خوێن گەرمانە بکەین کە بە شێوەی بانگەوازلە کۆڕەکەیاندا ڕایان گەیاندن و مەبەست و ڕێبازی خۆیان و تیپەکەیان لە میانەیان دا خستنە ڕوو.

وەکوو نووسەرو شانۆ دۆستێکیش بە ئەرکی‌سەرشانمانی دەزانین لە دوو توێی ئەم کورتە باسەداداکۆکی‌یەکی ڕەواو بەڵگەدار لە بزووتنەوەی شانۆی‌کوردی بکەین کە هونەرمەندانی ئەزموونگەریی بەرلەوەی بە کردەوەو بەرهەمی سەرکەوتووی کوردی‌ڕەسەن بوون و پێویستی ڕێبازەکەیان بسەلمێنن؛

دەیانەوێ بە ناوی ئەزموونگەری‌و پەیرەوی‌لاسایی‌کردنەوەی چەند هونەرمەندێکی بەغداو لە ژێرپەردەی تاقی‌کردنەوەی نوێ؛ لە نرخ و ڕۆڵی‌ئەزموونەکانی بزووتنەوەی شانۆگەریی کوردی‌کەم بکەنەوەو هێڵێکی ڕاست و چەپ بەسەر هەوڵ و کۆششی‌داهێنەرانەی بە دەیان هوونەرمەندی شانۆیی کوردی‌دابهێنن!!. دەیانەوێ دەوری سەرەکی لە شانۆدا بەشێوەو تەکنیککی نوێی خواستراوەو بابەتی وەرگێردراوبسپێرن و بێز لە بابەت و ناوەرۆکی خۆماڵی بکەنەوەوهەوڵی قووڵ کردنەوەو پێشخستنی شانۆی کوردی‌نەدەن و شانۆیەکی ناوەرۆك و شێوە گۆزراوە بهێننە کایەوە!.

لە بارەی شانۆگەری‌و ڕەوتی بزووتنەوەکەی‌دا:

شانۆگەری چیرۆکێکەو لە سەر شانۆنمایش دەکرێ‌وخاوەنی بنچینەو مەرجە تایبەتی‌یەکانی خۆیەتی. هونەرێکەمێژوویێکی دێرینی هەیەو لە ڕیزی پێشەوەی هونەرەجوانەکان دەوەستێت..

گەلێك جار ژیانی کۆمەڵ بە هیواوئازارەکانیەوە بە شێوەیەکی بچووك کراوە لەسەر تەختەی‌شانۆدا پیشان دەدرێت و بینەر لە گەڵ ڕووداوەکان دادەگونجێت یان بە گوێرەی فەلسەفەی ڕێبازەکەی تری‌شانۆ وەکو تەماشاکەرێکی ڕەخنەگر بەرهەمە پیشاندراوەکەدەبینێ‌و لی‌ی ورد دەبێتەوە.

زۆربەی هونەرە جوانەکانی‌تر لە چوارچێوەی هونەری‌شانۆدا جێگایان دەبێتەوەو دەقی شانۆگەریشی لە سەرتەختەی شانۆدا گیانی وەبەر دەخرێت.

ئاشکرایە کە هونەری شانۆ بو یەکەم جار وەکو هونەرێکی‌بەرزو سەربەخۆ لە وڵاتی یۆنانی کۆن (گریك) سەری هەڵداوە. بەڵام مێژوو ئەوەی بۆ دەرخستووین کە ئەم هونەرە لە سەرەتاکانی سەرهەڵدان و نەش و نماکردنی‌دابەم چەشنەی ئێستای نەبووە، بەڵکو وەکو هەموودیاردەیەکی کۆمەڵایەتی‌و ڕۆشنبیری بەسەر چەندەهاقۆناخ و هەڵس و کەوت دا تێپەڕیوە تا گەیشتۆتە ئەم ئاستەی ئێستا لە سەریەتی‌و بە باڵاترین جۆری هونەری ئەم سەردەمە دەژمێردرێت.

لە سەرەتاکانی ئەم سەدەیە بە دواوە جەماوەری‌هونەر دۆستی کوردستانی عیراق بە هۆی هەوڵ و کۆششی‌تاکە کەسی‌و بە کۆمەڵی ڕابەرانی بزووتنەوەی شانۆگەری‌ی‌کوردی‌و لە ڕێگای ئەدەب و تاقی‌کردنەوە شانۆیی‌یەکانی‌عەرەب و تورکەکانەوە ئاشنایەتی‌یان لەگەڵ هونەری‌شانۆدا پەیداکردووەو ئەمەش مەسەلەیەکی ئاسایی‌یەوهیچ جۆرە خەوشێکی بەسەرەوە نی‌یە، بینەری کورد بەپەرۆشی بینینی ئەو تەمسیل و شانۆگەری‌یانە بوو کەلەسەر سەکۆو شانۆی قوتابخانەکان و دەرەوەی‌قوتابخانەکان پێشکەش دەکران.

لە ساڵانی پەنجاکان و لە پاشانیش لە ساڵی ١٩٧٠ بە سەرەوەکە بارو زرووفێککی لەبارتر هاتەکایەوە بزووتنەوەی‌شانوگەری کوردی پەرەی سەندو گەلێك تیپی هونەری‌وشانۆیی لە شارەکانی کوردستان دا دامەزراون و ناوە ناوەیش نەك بە بەردەوامی کاری درامی سەرکەوتوو لە سەرشانۆکان و لە تەلەفزیۆن پێشکەش کراون. کە دەرچوانی‌ئەکادیمیاو پەیمانگای هونەرە جوانەکانیش هاتنە مەیدان بزووتنەوەکە پتر لەسەر بنچینەیەکی زانستانە هەنگاودەنی‌و ئاسۆیەکی فراوانتری گرتوتەبەرە خۆی.

بەڵام کە ڕەوتی بزووتنەوەی شانۆگەری‌ی کوردی‌بە گوێرەی هێڵێکی بەیانی بەردەوام سەرەو ژوورنەبوتەوەو ناوە ناوە نوشوستی هێناوەو بەرهەمی لاوازی‌بەخۆوە بینیوە. ئەمەش دیاردەیەکەو هۆی تایبەتی‌ومەوزووعی خۆی هەیەو نەك تەنیا بزووتنەوەی‌شانۆی کوردی بەڵکو شانۆی عیراق و زۆربەی‌وڵاتە پەرەئەستێنەکان یان (جیهانی سێیەم) بەم بارودۆخەدا تێپەڕیون و لەم جۆرە وەزعەدا ژیاون.

بانگەوازی ئەزموونگەریی‌و چەند دێرێك لە پێناوی شانۆی‌کوردی‌دا:

لەم ڕۆژگارەدا تاخمێك لە هونەرمەندە شانۆیی‌یەخوێن گەرمە تازە پێگەیشتووەکانمان هاتوون بە ناوی‌ئەزموونگەری‌و شێوە پەروەری‌یەوە هەوڵی سڕینەوەی‌ڕابوردوو واقیع دەدەن و بە قسەی ئەوان گوایە: «کارگێرانی شانۆی کوردی مادامەکی گشتیان ئەکادیمی‌نین و ئاگاداری شێوازی هەموو دەرهێنەرەکانی جیهان وسەرتاپای تاقی‌کردنەوەی ئەزموونگەریی دونیا

نین وپشت به واقیع دەبەستن و خەونی سەوز نابینن . . با دەمکوت بن و ئاشبەتاڵی لێ بکەن . . ، !!! وا بزانم ئەم جۆرە هەڵویستانە ئارەزووی خۆ بەدەرخستن وسەرنج ڕاکێشانی خوێنەرو بینەرانی مەبەستەوهیچی تر نا . .

یا به ناوی شانۆی ئەزموونگەری‌و دوای‌چەند ساڵ خوێندنی ئەکادیمیاو خوێندنەوەی چەند سەرچاوەیەکی‌بیانی‌و بێ ئەوەی کەس له خەونه سەوزەکانیان گەیشتبێ‌وچی وایان وەکو بەڵگەی دان پیانراو له لایەن بینەرانەوەپێشکەش کردبێ؛ خەریکن هێڵێکی ڕاست و چەپ بەسەرڕابوردووی حەفتا ساڵەی شانۆی کوردی‌دا دێنن وبه سووك و سانایی.

دەڵێن: «ئێمه خاوەنی بزووتنەوەیەکی شانۆیی کوردی تەواو نین وکامەیه شانۆی کوردی؟»!!.

هەروا بێ ئەوەی ئەمەکداری بەرامبەر ئەو هونەرمەندو تیپەشانۆیی‌یانە بنوێنن که فێری ئەلف و بێ‌ی شانۆیان کردوون وبه له خۆبایی‌بوونەوە دەڵێن: «. . پێویسته هەموو تیپەشانۆیی‌یەکان و کارگێڕانی شانۆی واقیعی کورد دەست له کاری هونەری‌هەڵگرن و دەرگای تیپەکانیان داخەن و تەنیا تیپی شانۆی‌ئەزموونگەریی به هۆی (خۆزگەو خەون بینینەوە)!! له توانایداهەیه به ئەرکی بناغه دانانی شانۆی کوردی هەڵسێ»!!.

له هەمان کاتدا ئەگەر بیر له (تاقی‌کردنەوەی) ئەوانیش بکەینەوەبۆمان دەردەکەوێ کەچی نوێیان نەخستۆته ڕوو جگه له دووبارەکردنەوەی ئەو بەرهەمانەی له ئەکادیمیاو پەیمانگا بۆ مەبەستی خوێندن وئەتروحه پێشکەش کراون یان بەرهەم و قسەو ڕێبازی مامۆستاکانیان بێ‌گونجاندن لێرەو لەوێ دەجوونەوەو له بارەی بەرهەم وداهێنانی خۆماڵیشەوە دەڵێن: « نووسین و بوونی دەقی‌خۆماڵی گرنگ و پێویست نیەو پەرینەوەی پردی سیراتیش نیه»!!

یان دەڵێن: «با واز له تەك وەرگرتن له کەلەپووری‌نەتەوایەتیمان و مێژوو بێنین و ئەمه ئەرکی مێژوو نووسەکانه ، نەك شانۆ»یان دەڵێن با ئەم ئەرکه دواخەین تاکو شانۆی‌کوردی لەسەر بناغەی ئەزموونگەری دادەمەزرێت »!!.

ئەم هونەرمەندە ئەزموونگەری‌یانە که دەیانەوێ مەسەلەی‌کەلك وەرگرتن له مێژووو فۆلکلۆر بۆ نووسینی دەقی شانۆیی داهێنەرانە بخەنەدواوە، تۆ بڵێی که ژمارەیەکی زۆر لەکەلە نووسەرو دەرهێنەرەکانی جیهان هەر له ئەسخیلۆس ویۆرپیدیس . . تا دەگاته شکسپیرو بریخت و زۆری تر لەهاوچەرخەکانمان له ئەنجامی پشت بەستانیان به گەنجینەی مێژووکەلەپووری نەتەوەکانی خۆیان و مرۆڤایەتی گەلێك بەرهەمی‌شانۆیی نەمریان پێشکەش به بزووتنەوەی شانۆیی‌جیهان کردووە.

له بارەی شانۆی کوردیشمانەوە تاکو ئێستا بینەری کورد پترشەیدای بینینی بەرهەمی واقیعی‌و مێژوویی خۆماڵی‌یە، ئەوبەرهەمانەی به بۆچوون و بیری پێشکەوتووو هاوچەرخ چارەسەری مێژوو واقیع دەکەن و هەست و سۆزی شۆڕشگێرانەله لای بینەردا دەبزوێنن و تام و چێژێکی تایبەتی پێ دەبەخشن. شانۆگەری‌یەکانی (مەمەو زین) و (قەڵای دمدم) و (خاتووکلاوزەر) و (هەڵۆکان . . ) . . هتد زیندووترین نموونەو بەڵگەی‌ئەم بۆچوونەمانن. ئەگەرچی له بارەی بینای درامی‌و چنین ودارشتنی کاراکتەر . . هتد ناگەنه ئاستی بەرهەمه جیهانی‌یەکان.

بەڵێ ئێمه هەر بەم بۆنەیەوە دەپرسین و دەڵێین: «ئەگەر بێت وهەر بەرهەمێکی هونەری مەبەستی گۆڕینی شۆڕشگێرانەی واقیع نەبێت و له ناو بۆتەی شێوەو تەکنیکیکی پێشەکەوتوودا پێشبینی قۆناغێکی گەشترو پێشکەوتووتر نەکات و هەست و پێداویستی‌مرۆڤی کوردو مرۆڤایەتی پێشکەوتنخواز دەرنەبڕێت و تەنیا لەدەروون و خودی مرۆڤ بکۆڵێتەوەو شێوەو تەکنیکێکی ئاڵۆزونوێ مەبەست بێت و بەس، تۆ بڵێی ئەم جۆرە هونەرەچ سوود به بینەری کوردو باری‌ئێستای کوردەواری‌ببەخشێت و ئایا بۆی دەکرێ جێ پێی خۆی له نێوەندی ڕۆشنبیری‌کوردی بچەسپێنێت و جێگای له نێو دڵی هونەر دۆست وجەماوەری هۆشیاری کوردەواری بکاتەوە؟!.

بۆ سەلماندنی ئەم بۆچوونەیشیان که گوایه کورد نەبۆتەخاوەنی شانۆیەکی نەتەوایەتی ڕەسەن، ڕابەرانی شانۆی‌ئەزموونگەریی کوردی دەڵێن: «شانۆگەری‌یه

خۆماڵی یەپێشکەش کراوەکان، با دەرهێنەرو ئەکتەرەکانیشیان کورد بووبن بەڵام مادامەکی لە دەرهێنان و تەکنیك و شێوەداپشتیان بە تاقی کردنەوەی شانۆیی بیانی بەستاوە؛ ئێمە خاوەنی شانۆی کوردی ڕەسەن نین»!!

جا ئەگەر بەم پێوانەیە بێت، دەبێ برا عەرەبەکانی عیراق وگەلەکانی تری ناوچەی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست و زۆر شوێنی تری جیهان نەبووبن بە خاوەنی شانۆی خۆماڵی یان.

چونکە هەر میللەتێ لە دانیشتووانی ئەم ناوچەیە لەسەرەتاوە هونەری شانۆو شێوەو تەکنیکی ئەم جۆرە هونەرەبەرزو پێشکەوتوویان لە وڵاتانی لە خۆیان پێشکەوتووتر بەتایبەتی لە ئەورووپاوە پێ گەیشتووە، کە لە ڕووی شارستانێتی هاوچەرخەوە گەلێك لە ئێمەو گەلەکانی تری ناوچەکە لە پێشترن..

ئاشکرایە کە شانۆی هەر میللەتێك لە ئەنجامی پێشگەیشتن بارو زرووفێکی مەوزووعی سەر هەڵئەدات ونەش و نما دەکات و دەبێتە خاوەنی بەرهەمی داهێنەرانەوبۆ پتر گەشە سەندنیش مافی خۆیەتی کە سوود لەفەلسەفەو ڕێبازو تاقی کردنەوە سەرکەوتووەکانی گەلان وەربگرێت.

ئەمەی سەرەوە لە لایەك؛ لە لایەکی ترەوە دەڵێین؛ تۆبڵێی شەیداکانی شانۆی ئەزموونگەریی فەلسەفەکەیان بە ڕێبازێکی خۆماڵی ڕەسەن تێبگەن و نەزانن کەتاقی کردنەوە هونەری یەکانیان یاخود ئەزموونەشانۆیی یەکانیان لە ڕووی دەرهێنان و تەکنیکی شانۆیی یەو لاسایی فەلسەفەی بیانی هاوچەرخەو لە ئەورووپاوە لەڕێگای هەندێ لە مامۆستایانی ئەکادیمیاو پەیمانگاکان وسەرچاوەی بیانی یەوە بەوان (ئەزموونگەریی یەکانی لای ئێمە) گەیشتوون و بابەتەکانیشیان لە ئەدەبی بیانی یەوە وەرگیراون و بۆ بینەری کورد تا ڕادەیەك نامۆو کەم سوودن؟!.

ئێمە لە کاتێکدا دان بەوەدا دەنێین کە بزووتنەوەی شانۆی کوردی پێویستی بە هەوڵ و کوششی هەموو لاوێکی خوێن گەرمی ئەکادیمی و غەیری ئەکادیمی هونەرمەندو بە دەسەڵات هەیە، پێویستی بە تەکنیك و شێوەی هونەری داهێنەرانەوتاقی کردنەوەی نوێ هەیە، پێویستی بە رزگاربوون هەیەلە نمایش و بەرهەمی بێ کەڵك و لاوازو سواوە، بەڵام دەبێ مەرج و پێداویستی یەکانی پەرەدان بە بزووتنەوەکە بەهەرەوەزی و هاریکاری و هەوڵی دڵسۆزانەی هەموو لایەك ئەنجام بدرێن.

هەروا دەبێ دان بەو ڕاستی یە کە هونەرمەندانی کوردبە درێژایی دەوروبەری حەفتا ساڵ توانیویانە بوونی خۆیان بسەلمێنن و بزووتنەوەیەکی شانۆیی نەك بازرگانی بەڵکوکۆمەڵایەتی و شۆڕشگێڕو نوێ خواز بخولقێنن لەو ماوەیەدالەسەر تەختە پیرۆزەکانی شانۆی کورد بە دەیان نەك بە«ژمارەی پەنجەی دەست» بەرهەمی شانۆیی سەرکەوتوو پێشکەش کروان و ئێمەیش بەم بۆنەیەوە ناوی ئەو بەرهەمانە دەهێنینەوە یاد کە هەمیشە لەسەر لاپەڕەی گۆڤارو ڕۆژنامەکوردی یەکان دا لەسەریان نووسراوەو یادیان کراوەتەوەو دەکرێتەوە: «سەلاحەددین ئەیوبی ساڵی ١٩٢١ـ هەولێر» «عیلم و جەهل ١٩٢٦ سلێمانی» «نیرۆن ١٩٢٧ سلێمانی» «کچی کوردستان ١٩٣١ کۆیە» «دلداری و نیشتمان پەروەری ١٩٣٣» «مەم و زین ١٩٣٥»، یۆلیوس قەیسەر، تێکۆشانی ڕەنجدەران، سەربازی ئازا، کلۆڵان، عوتەیل، گوڵی خوێناوی، نیرۆن، کاوەی ئاسنگەر، خانزاد، هاملێت، فاڵچی، مەسەلەی شارێك، چڵپاو، پسکەی تەڕپیر، بووکی ژێر دەواری ڕەش، سەرینی باداری، نرخی ئازادی، لە ڕێی نیشتمان، جەنابی موفەتیش، دیوار، تاوانێك لە ئاسمانا، نەفرەت لێ کراو، من دایکتم ئەی شاکر، بووکی خوێناوی، پژمین، چاوی ڤێتنام، کۆتایی زۆردار، قەڵاچۆکردنی نەخوێندەواری، ..

لەگەڵ هەڵکشان و پەرەسەندنی کۆمەڵ و بزووتنەوەی ڕۆشنبیری دا هۆڵەکانی شانۆ لە کوردستان دا بەرهەمی پێشکەوتووتریان بە خۆیانەوە بینیوە، بۆ نموونە وەکو:

«خولە چەخماخە، مان گرتن، لانەوازان، بە زۆر کراوە بە دکتۆر، مۆڵەت، خەج و سیامەند، پردی ئارتا، پێشمەرگە، شاخەوانی مەزن، دوا گۆرانی، ئاسك، شیرین و فەرهاد، خەملی پەمۆو، لافاو، هەڵەی دەرهێنەر، مەم و زین ی تەلعەت سامان، داس، شەوی کۆتایی، تەقینەوە ی سلمان فایق، کۆتایی دەرەبەگ، ژیان، مەزاتخانەی مێژوو، خۆر هەڵاتن،

شەهید، نهێنی، بیك و زاڤا، ئامانجی زۆرداری، ئوتومۆبیلچی، پیلان، قەل و رووتە، پیشانگا، بووکی بەفر، گێچەلەکانی حەمە وەی وەی، هەبوو نەبوو، ئەو پیاوەی بوو بە سەگ، مام حەسەن دەگەڕێتەوە، فایلی ٦٧، خانزادێکی تر، مۆکینبوت، وانەی رەشبەلەك، لاس و خەزاڵ، قەلای دمدم، کەللەسەر، شاری ئەوین، ئۆتێللۆ، ئادابا، بزاڤ، گازیەك ژ کاوەی، دوو رەگە، خاتوو کلاوزەر، کوێر ئۆغلی، هاوارێکی

تاساو، نالیو خەونێکی ئەرخەوانی، شار، ژیانی گالیلۆ، خۆناسەکان، کاتێ هەلۆ بەرز ئەفرێ»... هتد

له بواری درامانووسین دا تاکو ئێستا ژمارەیەك له نووسەرانی کورد خۆیان تاقی کردۆتەوەو ناوە ناوە گەلێك شانۆنامەو چیرۆکی؛ تەمسیلییان بە دانان و ئامادەکردن و وەرگێران بلاوکردوونەتەوە جا چ له دوو توێی کتێبی سەربەخۆ

یان لەسەر لاپەرەی گۆڤارەکان دا بووبن.

ژمارە تایبەتییەکانی (ڕۆژی کوردستان) و (کاروان) و (بەیان) کە چەند جار بۆ دەقی شانۆیی تەرخان کراون و ژمارەیەك دەقی شانۆیی کوردی سەرکەوتوویان تیا بلاوکراونەتەوە شایەدی ئەم بۆچوونەمانن.

بەلام لە هەمان کاتدا دان بەمەدا دەنێین کە یەکێك لەوگیروگرفتانەی لە بەردەم پێشخستنی بزووتنەوەی شانۆیی کوردوەستاوە کەمی درامانووسی هونەرمەندو پسپۆری کوردو دەقی خۆمالی سەرکەوتووە بە تایبەتی لە رووی بینای درامیو لایەنی هونەری ترەوە.

.کەمی درامانووسی سەرکەوتووی کوردیش بە پلەیەکی سەرەکی بۆ بەردەوام نەبوونی دەگەڕێتەوە.

ئەگەر بێت و ئاورێك لە ڕێڕەوی ڕۆشنبیری کورد بدەینەوەدەبینین بەچەند قۆناغێکی جیا جیاو تا ڕادەیەك نالەبار ڕۆیشتووەناوەراستی بیستەکان و سەرەتای سالانی سییو کۆتاییچلەکان و بەر لە شۆڕشی چواردەی تەمووزو قۆناخی شەستەکان...

لەو سەردەمانەدا نووسەر کەم بواری بۆ لوا. کە ئەوەیپێویستەو لە دلیا پەنگی خواردۆتەوە دەری ببرێت و بیخاتە سەر کاغەز و بلاوی بکاتەوەو لە دواییشدا بخرێتە سەر شانۆ.

لەو کاتانەیش دا کە بزووتنەوەکە جۆرە هەناسەو هەوایەکیهەلمژیوە بە تایبەتی دوای شۆڕشی چواردەی تەمووزو لەحەفتاکان و هەشتاکان دا زۆر نووسەری بە توانا دەرکەوتن - ئیترکەئەم دوو ماوەیەش لە کورتیان داوەو بواری سەربەستی دەربڕین تەسك بۆتەوە ئەم نووسەرانەش کەم بۆیان کراوە بەردەوام بنووسن وداهێنانەکانیان بلاو بکەنەوە یان روویان کردۆتە مەیدانێکیتری ئەدەب و نووسینەوە. لە دواییدا چەند ناوێکیتر هاتوونە مەیدانەوە، ئینجا هەر چۆنێ بێ تا ئەمانیش

خەریکی شارەزاییپەیداکردن بوون ئاووهەواکە گۆڕاوەو گیانی پسپۆرێتیهونەرییان لە لادا گەشەی نەسەندووە..

سەرەرای ئەم وەزعەیش دەبێ دان بە دەست و پەنجەو بیرییاك و بەرهەمە درامییەکانی ئەم بەڕێزانەی خوارەوە بنێین کە هەریەکەو خشتێکی یان چەند خشتێکی ناوەتە سەر بناغەوبینای بزووتنەوەی شانۆگەری کوردی لە ڕێگای

دانانیدەقی شانۆییدا:

«عبد الرحيم رەحمی هەکاری، جەلادەت عالی بەدرخان، أ. ب هەوری، پیرەمێرد، زەکی هەناری، رەفیق چالاك، ئەمینی میرزا کەریم، عمر علي امين، عبد الرزاق بیمار، طلعت سامان، نافع ئاکرەیی، شێرکۆ بێکەس، مەهدی

ئومێدا، حسین عارف، حەمە کەریم هەورامی، جەلیل زەنگەنە، فؤاد مجيد میسری، محمد عبد الرحمن زەنگەنە، محمد رشید فتاح، رەئووف بێگەرد»... هتد

لە بیستەکانی ئەم سەدەیە تاکوو ئێستا ژمارەیەکی زۆرلە هونەمەندە شانۆییە بە تواناکانمان بە ئەکتەرودەرهێنەرەکان بە شدارییان لە رەوتی بزووتنەوەیشانۆگەری کوردیدا کردووەو هەمیشە هەولیان داوەوهەول دەدەن لە ڕێگای پشت بەستان بە

تاقیکردنەوەینوێو ڕێبازی زانستانە بەرهەمی داهێنەرانەپێشکەش بکەن و بزووتنەوەکە بەرەو قۆناخێکیپێشکەوتووترو گونجاوتر بگوازنەوە.

جا تۆ بلێی ئەم هونەرمەندە بەڕێزانەی خوارەوە لەئەزموونگەری حالی نەبووبن و حاشایان لە تاقیکردنەوەی نوێوداهێنان کردبێت؟

«فؤاد رشید بکر، جەواد رەسوول ناجی. رەفیق چالاك، عبدالخالق قطب، رەؤوف يحيى، تەها خلیل. کاوەی احمد میرزا، تەها بابان، صفوة جراح، بەدیعة

دارتاش، طلعت سامان، غازی بامەرنی، سمکۆ عزیز، عثمان چیوار، زرار محمد مصطفی، سلمان فائق کاکەیی، احمد سالار، صباح عبدالرحمن، جلیل زنگەنە، کمال رؤوف هەنجیرە، علي کریم، عبدالواحد مرجان، فرهاد شریف، کامەران رؤوف، خوشکە گەزیزە، سەعدوون یونس، فتاح خطاب، ئازاد جلال، سلام کۆیی، جیهاد دلپاك، شمال عبدالله، زاهیر محمود، نوزاد مجید، مؤید فەقێ، یاسین قادر بەرزنجی، بائیز عمر، شفیق محمد، ئازاد مولود، ئازاد عبدالله صادق، رفعت رجب جمال» . . . زۆرانی تر لەهونەرمەندە سەرکەوتووەکانی بواری شانۆی کوردی لە کوردستانی‌عیراق دا.

لە رۆژنامەی (ژیان)ی بیستەکانی سلێمانی تاکو (کاروان)و (بەیان)و (هاوکاری)و (عیراق)ی ئێستا، گۆڤارو رۆژنامەکوردییەکان، بەردەوام رەخنەو لێکۆلینەوەو نووسینی تریان دەربارەی شانۆ بە گشتی‌و شانۆی کوردی‌و شانۆگەرییەپێشکەش کراوەکان بلاوکردوونەتەوەو چێژی رۆشنبیری‌شانۆیی‌یان لە لای خوێنەرانی کورد پەیدا کردووەو پەرەیان پێ داوە.

هەروا شانۆی کوردی ئێستا بۆتە خاوەنی بینەری تایبەتی وبەشێکی چاك لە بینەران با کەمیش بێ، بە هۆشیاری هامووشۆی شانۆکان دەکەن و بەرهەمی سەرکەوتوو لە بەرهەمی‌لاوازو سواوە جیا دەکەنەوەو ئەم جۆرە بینەرانەیش بۆیان هەیە ببنە کەسایەتی سێیەم لە شانۆی کوردی‌داو بە سەرنجی‌رەخنەگرانەو پێشنیازی بەجی‌و پەسند دەور لە پێشخستنی‌شانۆدا ببینن.

تاکو ئێستاکەیش چەندان کورو زنجیرە لێکۆلینەوە وفێستەڤال دەربارەی شانۆو ئەدەبی شانۆیی لە بەغداوشارەکانی کوردستان دا ساز کراون و بوونی بزووتنەوەیەکی‌زیندووی شانۆی کوردی‌یان سەلماندووە. وەکوو:

١ـ یەکەم میهرەجانی هونەری کوردی کە لە ٢٥ـ٢ تاکو ٢ـ٣ـ١٩٧٠دا لە بەغدا ساز کراو پتر لە (١٠) شانۆگەری‌کوردی تێ پێشکەش کرا.

٢ـ یەکەم زنجیرە لێکۆلینەوەی شانۆو ئەدەبی شانۆیی کەلە ٢٦ـ١٠تاکو ٣٠ـ١٠ـ١٩٨٥لە شاری هەولێرو لە لایەن دەزگای‌رۆشنبیری‌و بلاوکردنەوەی کوردی رێکخراو تیایدا (١٨)باس و لێکۆلینەوە دەربارەی شانۆو ئەدەبی شانۆیی پێشکەش کرا.

٣ـ یەکەم ڤێستەڤالی شانۆی ئەزموونگەری کوردی ـ لە رۆژانی ٢٨ـ٣تاکو ٣٠ـ٣ـ١٩٨٧دا لە لایەن پەیمانگای هونەرە جوانەکانی سلێمانی ساز دراو تیایدا سەرەرای چەند نمایشێکی شانۆیی‌باس و لێکۆلینەوەی جۆراو جۆریش دەربارەی شانۆ پێشکەش کرا.

٤ ـ زنجیرە کۆرێك دەربارەی شانۆ لە دهۆك، ئەمەشیان لە ١٧ تا ٩ـ١١ـ١٩٨٧دا لە لایەن رۆشنبیری جەماوەری دهۆك بەهاوکاری لەگەل یەکێتی ئەدیب و نووسەرانی کورد لە دهۆك رێکخراو ژمارەیەك هونەرمەندی شانۆیی ناسراو بەشداریان تیادا کردو چەند شانۆگەرییەکیش لە چوار چێوەی حەلقەدراسیەکەدا پێشکەش کرا.

٥ـ دووەم میهرەجانی شانۆی کوردی کە لە ١ـ٤ تاکوو٧ـ٤ـ١٩٨٨لە لایەن پەیمانگای هونەرە جوانەکانی سلێمانی‌رێکخراو تیایدا ژمارەیەك تیپی شانۆیی شارەکانی‌کوردستان بەشدار بوون و چەند شانۆگەرییەکی خۆماڵی‌سەرکەوتووی تیا پێشکەش کرا، سەرەرای سازدانی چەند کۆرێکی‌رەخنەیی دەربارەی شانۆگەرییە پێشکەش کراوەکان.

٦ـ یەکەم دیداری شانۆی کوردی، سلێمانی ١٩٨٨.

ئەمەو سەرەرای سازدانی بە دەیان کۆری تر لە لایەن هونەرمەندو نووسەرە بەرێزەکانەوە دەربارەی شانۆونەدەبی شانۆیی‌و شانۆگەرییە پێشکەش کراوەکان.

٧ـ ڤێستەڤالی شانۆیی هونەرمەندانی هەولێر ١٩٨٨

ئەمە هەمووی راستین و رووداون و بوونی بزووتنەوەیەکی زیندووی شانۆگەریی کوردی دەسەلمێنن و ئەم بزووتنەوەیەش بەشێکە لە رووی شارستانیەت و بزووتنەوەی رۆشنبیری کوردی و سەرەرای هەموو کەم و کوری‌و گیروگرفتەکانیش پێوستەدانی پێ بنرێ‌و بە رێزەوە سەیر بکرێت و کارێکی رەواش نییەبە بزووتنەوەی شانۆیی گەلانێك بپێوری کە لە رووی‌بوونی قەوارەی سەربەخۆو پێشکەوتنی شارستانیەت وتەکنیك دا چەند قوناغ پێش ئێمە کەوتوون دوواکەوتنی‌ئێمەیش لە چاو ولاتە پێشکەوتووەکان دا مایەی کەمی نییە بۆئێمەی کوردی‌زیندوو بەئەگەر هەرێ تایبەتی مێژوویی خۆی هەیەو ناکرێ لیرەلێی بکولدرێتەوە بەلام لە هەمان کاتدا بڕوامان بەوە هەیە کە لە دوا رۆژدا شانۆی کوردیش شان لە شانی‌شانۆ پێشکەوتووەکانی جیهان دەدات.

هەولێر ٩/١٩٨٨

# فەقێ تەیران

ناڤ و دەنگێ فەقێ تەیران هۆزانڤان و دەنگبێژ ێ کوردێ


پرۆفیسۆر قاناتێ کوردو
نڤیسی‌یە

عبدالسلام علی میرزا
ژتیپین لاتینی ڤەگوهاستیە


ناڤ و دەنگێ فەقێ تەیران هۆزانڤان و دەنگبێژ ێ کوردێ مەزن زووڤا ل ناڤ خەلقێ کورد دا عەیانەو ئاشکەرایە. گەلەك هۆزان، بەیت، خواشخان و سترانێن وی ل ناڤ جماعەتێ‌دا بەلاڤ بوونە، هاتنە گۆتنێ، سترانی و نڤیساندنێ. بەیت، هۆزان، خواشخان و سترانێن وی نەك ب تەنێ دەرهەقا حەزکرنێ و ئەڤینێ‌دا هاتنە گۆتنێ و نڤیساندنێ، لێ ئەووسان ژی دەرهەقا سروشت و فیلۆسیفی‌یێ‌دا هاتنە نڤیساندنێ و لوولاندنێ. هۆزان و بەیت و لوولانێن ووسان ل ناڤ خەلقێ کورد بەلاڤ بوونە، کو ب پرانی‌یا خوەڤا ب زارگۆتنا جماعەتێ‌را هاتنە گرێدانێ، ل ناڤ وان دا گەلەك جاران خواشخان، مالیك و بەندێن هۆزانان، بەیتان ژ فۆلکلۆرێ کەتنە ناڤ نڤیسارا وی، ووسان ژی گەلەك هۆزان و بەیتێن وی کەتنە ناڤ زارگۆتنا جماعەتا کوردان و تەنێ حەسابکرنێ هونوورێ زارگۆتنا جماعەتێ. ب نهێرین و نەزەرا خەلقێ کورد فەقێ تەیران هۆزانڤان و دەنگبێژ ێ باتنی‌یە، ئەوزمانێ تەیر تەرەوولان دزانیبوو، دەنگێ سروشتا زێندیو نەزێندیو دزانیبوو ب تەیر و تەرەوولان را، سروشتا زێندیو نەزێندی تا خەبەر ددا، سەبەب وێ یەکێ خەلقێ کورد ناڤێ [فەقێ تەیران] ل وی کرنە. ناڤێ وی ب راستی [محەمەد فەقی بوویە]، یاژی محەمەد فەقێ تەیران بوویە، ئەوی ب خوە ل سەر نڤیسارێن خوە ناڤێ خوە کورت دنڤیسی: [مین - محێ].

ئالێکساندر جابا دنڤیسە [هۆزانڤانێ دن مین محێ‌یە]، محەمەد فەقێ تەیران، ئەوژ موکسێ وەلاتێ هەکاری‌یێ ل سالا ۷۰۲ هیجری [۱۳۷۵ - ۱۳۷٦] هاتی‌یە دنیایێ، بەیتێن [شێخێ سەنعان]، [هەسپێ رەش]و[بەرسیس] نڤیسارێن وینە، عەبدولرەقیب یووسف ل نڤیسارا خوەدا [دەستنووسا بەرسیس ل بەرهەڤی‌یا فەقێ تەیران دا] دنڤیسە: [فەقێ تەیران یەك ژ هۆزانڤانێن کوردان، یێ کو بناخا

ئەدەبیەتا کوردی دانی یە تەیران ژ هۆزانڤانێن پایەبلندن بوویە، گەلەك بەرهەڤی ل دوو خوە هشتی یە، بەرهەمڤێن نڤیسارێن وی گەلەك سادەو سازرەڤانن و نێزیکی شۆپا قسەکرنا جامێری یا خەلقی نە. ئەم دکارن بێژن، کو بەرهەڤی یا نڤیسارێن فەقێ تەیران پارەڤەدبن سەر دوو جووران:

١ ـ هۆزان، هەلبەست و قەسیدێن بەلاف ـ بەلاف.

٢ ـ چەند چیرۆك و داستانێن ئاینی و نەتەوەتی.

فەقێ تەیران یەك ژ وان کەسان بوویە، کو چیرۆك ب کوردی نڤیسی یە. هۆزان و هەلبەستێن فەقێ تەیران ل ناف خەلقێ بەلاف بوونەو جەند بەرتوکێن وی، یێن کو ئەم نافێ وان دزانن، ئەڤێن ژێرینن: ـ

١ ـ [شێخێ سەنعان] یان ژی [شێخێ سەنعانیان] ل سالا ١٠٣٠ ـ دا نڤیسی یە. ئەڤ چیرۆکە ٧٢٠ ریزێن هۆزانانن، ب تەڤی وێ ل دەستنڤیسارێ دا سێ حەب دەستنڤیسار هەنە: ـ

١ ـ هەسپێ رەش

٢ ـ سیسەبان

٣ ـ بەرسیسی عابد، و ٤ ـ دمدم.

هنەك دبێژن، کو چیرۆکا [فەرخ و ستی] ژی یا فەقێ تەیرانە].

ب فکرا من ژڤان بەیتان، یەکو عەبدولرەقیب یووسف چیرۆکان لێ کری یە، هەژ بەیتا [دمدمێ] نە نڤیسارا فەقێ تەیرانە، بەیتا [دمدم] ل سەدسالی یا ١٦ و دەستپێکا ١٧ ـ دا پەیدا بوویە، تێ دا دەرهەقا خانێ کوردان، خانێ چەنگ زێرین دا تێ گلی کرنێ، دبە، کو بەیتا [دمدم] دەنگبێژان یان هۆزانڤانەکی کورد دن ل هەڤ ئانی یە، ژ بەر خوە دەرخستی یەو ئەو ل ئاخا بەهدینان یان ژی ل ئاخا جزیرا بۆتان بەلاف بوویەو ب سەرنافێ فەقێ تەیران هاتی یە نڤیساندنێ.

عەبدولرەقیب یووسف ل نڤیسارا خوەدا، یا ل ژۆرێ من نافێ وێ کۆت، د نڤیسە: [دەستنڤیسارا کو[بەرسیسی عابد] تێ دا هاتی یە نڤیساندنێ، ژ ٢٨ بەلگانە، هەر بەلگی دا ٢٣ ریزێن هۆزانانە، هەر تەنێ ل دو ـ سێ بەلگان دا دو ـ سێ مالکن، دەستنڤیسار ب حوبرا رەش ل سالا ١٩٦٩ ل گوندێ بارمی یێ ل رۆژاڤا جزیرا بۆتان ب دەستێ کوری حاجی رەشید کەڤشانی هاتی یە نڤیساندنێ]. ل فۆلکلۆرا مەیا کوردی دا ناڤێن بەیتێن [شەرێ سیسەبانێ]، [هەسپێ رەش]، [فەرخ و ستی] تێنە گۆتن و گلی کرنێ مینا بەیتێن زارگۆتنێ. مەسەلە نافێ وان ل بەرهەڤوکا فۆلکلۆرا کوردی دا یا ئالبێرت سۆسن ل سالا ١٨٨٠ ل پێتربوورگێ دا چاپ بوویە، هاتی یە نڤیساندنێ و گلی کرنێ. ووسان ژی نافێ گەلەك هۆزان و هەلبەستێن فەقێ تەیران ل فۆلکلۆرا زارگۆتنی دا تێنە گۆتنێ، مەسەلە [فەقێ تەیران و ئاف]، [فەقێ تەیران و رۆژ]، [دلبەرێ]و یێن دن. ل ڤان سالێن پاشن دا چەند هۆزانڤان و نڤیسکارێن کورد هەلبەست و هۆزانێن خوە ب نافێ فەقێ تەیران نڤیسی نە، کتێبوکێن خوە یێن بچووك ب نافێ فەقێ تەیران چاپکرن، مەسەلە عەتارێ شەرۆ، دو دونیا، ئێریڤان، سالا ١٩٥٣. روویێ ٤٠ ـ ٥٨، ئاچاچان، گولبهار ئێریڤان، سالا ١٩٥٧، روویێ ٧ ـ ٤٦. ئەگیتێ ئەحمەد، دزیکا فەقێ تەیران، ئێریڤان، سالا ١٩٧٠. ئوردیخانێ جەلیل، جەلیلی جەلیل، زارگۆتنا کوردی، مۆسکڤا ١٩٧٨ ـ ١ ـ روویێ ٥٣ ـ ٧٨.

م. ب. روودەنکۆ ل خەباتا خوەدا یا ب نافێ:

[opisani ye kurdskix rukopisey leningrad - skix sobranii, moskva, 1961

یانێ [سەروبەر نڤیساندنا دەستنڤیسارێن کوردی یێن ل لێنینگرادێ دا کۆمکری] دنڤیسە، کو ئا. جابا نڤیسی یە کو [بەیتا نەوالا سیسەبانێ] نڤیسارا فەقێ تەیرانە [٦٧]، لێ [قەولا هەسپێ رەش حکایەتا عەلی حریری یە] [٧٢]، ل پاشێ م. ب. روودەنکۆ دنڤیسە: ل دەما ئەز مژوولی لێگەرینا ئافراندنێن فەقێ تەیران دبووم. ئەز هاتمە سەر وێ فکرێ، کو حکایەتا شەرێ سەرهاتی یا دمدمێ د گەل قزلباشان] نە نڤیسارێن فەقێ تەیرانن.

ب گلیکی ئەدەبیەتناسێن کورد تەنێ سەر وێ فکرێ. کو هەر ب تەنێ بەیتێن [هەسپێ رەش]، [شێخێ سەنعان] [یان ژی دۆدا گورجان]، [بەرسیس]، و هۆزان و هەلبەستێن دەرهەقا سروست و فیلۆسۆفی یێ و ئەڤینداری یێ، یێن کو ل ناف خەلقێ کوردا زەفین و بەلاڤن، نڤیسارێن فەقێ تەیرانن.

ناڤەرۆکا بەیتێن [شەرێ سیسەبانێ] [یانێ ژی نەوالا سیسەبانێ]. [هەسپێ رەش]و[دمدمێ]، زووڤا ئاشکەراو

عەیـنـە، ئەو ل بەرهـەڤـوکێن فۆلکلۆران دا هاتنـە چاپکرن و تەرجمەکرنێ بنێرە: - A - Sosin, Kurdishe Samlungen, SPT 1880. حاجی جنـدی، ئەمینی عڤـدال، فۆلکلۆرا کورمـانجی، ئێریڤان، سالا ١٩٣٦، و Kurdskiye Pesni - Skazi Moskva, 1960. ناڤـەرۆکـا دەسـتـانـا [شێخێ سەنعـان]یـا، یا فەقێ تەیـران نێزیکی ناڤەرۆکا بەیتا [دۆدا گورجـانـە]، لێ ئەو ب رەنگێ بەدەوی، ب قەیـدە، فۆرم و کێش و قافیـیـا ئەدەبیـەتێ هاتی یـە هوونـانـدنێ و خەمـلانـدنێ [بنێـرە، فەقێ تەیـران، شێخێ سەنعـان، مۆسکڤا، سالا ١٩٦٥، بێشگۆتن، تێکستێن نڤیساندنا فەقێ تەیران، تێکستێن فۆلکلۆری و تەرجما وان ب رووسی، یا م. ب. روودەنکـۆ]. هەتـا ڤان سالێن پاشین ناڤـەرۆکـا بەیتا [بـەرسیس] نە ئاشکـەرابـوو. دنڤیسین و دگـۆتن، کو ئەو دەستنڤیـسـارا فەقێ تەیـرانـە، لێ مەزمـونـا وێ، ناڤەرۆکا وێ مەنـزان بوو. عەبـدولـرەقیب یووسف ل نڤیسـارا خوەدا کو ل ژ ورێ من ناڤـێ وێ گۆت، ب کورت ناڤـەرۆکـا بەیـتـا [بەرسیـسێ] نڤیسی یە.

ئەوی نڤیسی یـە: [پـادشـاکێ جنـان ب ناڤێ بەرسیس گەلـەك خوەدێ ترس ل وەلاتـێ شامـێ هەبـوویـە. ئەو ل شکـەفتـادا تەڤی پەزکـوڤی یـا دمـا، شەڤ و رۆژ تەڤی وان ل چۆلی دچێـری یـا، خوارنـا وی ئاڤ و گیهـابـوو، ئەو گەلـەکی ژاردبە، ل عەمرێ خوەدا دگەهێژە دەرەجا ئەولی یێن خوەدێ، خوەدەنـاسی، سپهیتی و قەنجی یـا وی ل ناڤ خەلقێ دا بەلاڤ دبن، خەلق تێن جەم وی، ژێرا خێر و بێرێ تینن، ئەو دوعا ل وان دکە. ب خوە نەشێخێ وی هەبوونە، نە ژی رێبەرێن وی.

شەیتـان گەلـەکی زۆرێ ددنـە خوە، کو بەرسیسی ژ سەر رێ یا راست دەرخن. شەیتانەکی بچووك، ناڤێ وی وەسیس بوویـە، دبێـژە باڤێ خوە شەیتـان: [خـەمـا مەکشینە، ئەزی بەرسیس ژ سەر رێ یـا راسـت دەرخـم]. ئەو جل و بەرگێن مرۆڤـان ل خوە دکـەو دچـە جیکی ل نێزیکی بەرسیس دمینە، گەلـەکی عەجیب دمینـە، کو ئەو مرۆڤـەکی گەلـەك سالـح و قەنجـە. بەرسیس تێ جەم وی و ئەو دبینـە هەڤالێن هەڤ، ب تەڤـایێ نڤێـژ و دوعا دکن، باسا پێغەمبەران و مرۆڤێن سپیهی و قەنـج دکن - بەرسیس ٦٩ سالی بوو عبـادەتێ خوەدێ دکـر. رۆژەکێ هەڤالێ وی [کورێ شەیتان] ژێرا دبێژە: [دڤێت شێخ و رێبەرەکی تە هەبە]. ئەو ژی دبێژە: [رێبەرێ من خدر ئەلیاسە]. کورێ شەیتان دبێژە: [ئەگەر من بکی شێخێ خوە، رێبەرێ خوە، ئەزێ تە تێخمـە سەر بنچـەنگـا خوە، ئەمێ بفـرن، هەرن ل جی یێ خوەدێ بلنـد]. ل سەر دەریـا فرین، ئبلیس فری هات، بوو تەیـرەکـی و بەرسیـس ل سەر پەرێ وی سوار بوو، فری سەر دەریـا ئۆسمـانی، ل پاش ڤێ بەرسیس باواری یا خوە ل کورێ شەیتان ئانی و ئەو کرە شێخێ خوە.

میرەك و دەستهلتا دارەك دەولەمند هەبوو، قیزا وی گەلەکی شۆخ و شەنـگ بوو، گەلـەك رنـد، بەدەو و دل رەڤین بوو، شەیتـان هاتبـوو خەونا کەچکی. دەڤ، لێڤ و چاڤێن لێ بوو، وەك کابـووس زمـانـەکی جەهنـەمی لێ بوو، ل جی دا دبـە سەهێ تاژی و ل گوهێ وێ دا دکـە قیـرین، ل ئاخری یێ ئەڤا ل کەچکێ دبە تاولەرزین و بەدەوی یا کەچکێ نامینە، باڤکێ وێ چەنـد ستیـرنـاس و رەملداران کۆم دکـە، وەکی بزانبـە نەخـوەشی یـا قیـزا وێ چی یـە. لێ ئەو چڤـاس ل کتێب و دەفتـەران دنێـرد، دکن ناکن تێ دەرنـاخن، ناڤ و نیشـانێ نەخـوەشی یێ لێ نابینن، هنـەك دبێـژن: [بـەلکی چاڤ لێ کەتنە]، ل باش ڤێ یێ هێڤی دمینن.

ئبلیس دچـە خەونـا دایکـا کەچکێ، دبێـژە: [ئەگەر حەز دکن قیـزا وە ساخ ببـە، قەنـج ببـە، بخـەملینن، ببنـە جەم بەرسیـس، برا شەڤ و رۆژان ل جەم وی بمینـــە]. باڤـکێ کەچکێ ژ وەزیـرێ خوە پرس دکـە، لێ وەزیر پێرا ـ پێرا رازی خەونـا وی نابـە، دبێـژە: [ئـەڤـا ئیشا حەرامە]. میر ب قەسا وەزیـر ناکـە، کەچکێ ب جوانتـرین دخـەملینـە، دبـە جەم بەرسیس، کووێ قەنـج بکـە، لێ بەرسیس تەماشا بەدەوی یا کەچکێ ناکـە، ناچـە جەم وێ، ئبلیس دچە جەم کەچکێ، دگـری، پەردێ ژ سەر ڕوویـێ وێ ددە ئالـیـکـی، داوا ژ بەرسیس دکـە، کووێ قەنـج بکە. چاخێ چاڤێ بەرسیس ل کەچکێ دکـەڤن، تەیـری دلێ وی دفـرە سەر کەچکێ، ل نقـومی رنـدی و بەدەوی یا وێ دبە، خوە ناگرە، ئیشێ خەراب پێرا دکە، لێ پاشێ پوژمان دبە، دبێژە ئبلیس: [وی حەساب دکـە شێخێ خوە، ئەڤ گونـەها پێرە کری یە، ئەوژ دبێژە: [تۆ بە کرن هەموو گونەهی دبە]، لێ دترسم قیزا من حەملە ببە].

گۆت وا باش دبە، تو کەچکێ بکوژی، کو دەستێ مەژی
خلاس بە، ئەم راستی شەرمزاری‌یێ نەبن].

بەرسیس کەچك کوشت و ل جیکی چال کر. شەیتان دیسان هاتی‌یە خەونا باڤێ کەچکێ و ژێرا گۆتی‌یە، کو بەرسیس ڤیزا وی کوشتی‌یە و فلان جی‌یی چال کری‌یە. باڤێ کەچکێ دچە بەرسیس دگرە و ڤیزا خوە ژ چالێ دەردخە، فەرمان دکە بەرسیس ل سێداری خن. چاخێ خەریك دبن بەرسیس سێدار بکن، شەیتان ل بەر بەرسیس د سەکنە، بەرسیس لاڤالێ دکە، کووی ئازاد بکە ئەوژی دبێژە: [ئەگەر سوجی من ببی سەرخوە، ئەزێ تە رزگار بکم]. ئەو سوجی وی دبە سەرخوە و ژ دین و دیانەت دەردکەڤە. هنگێ شەیتان خوە بێ دەدە ناسکرنێ، بەرسیس ژی ل سێداریێ دارداکری دمینە و حەفتێ سالێ عبادەتکرنا وی بادی هەوا دچن.

ب ڤی چوورەیی سەرهاتی‌یا بەرسیس ل دەستنڤیسارا فەقێ تەیران دا کوتا دبە].

ل کوتایی‌یا نڤیسارا خوەدا عەبدولرەقیب یووسف دنڤیسە، کو [سەرهاتی‌یا [بەرسیس] بەرێ پێشین ل ناڤ یاهوودی‌یان دا بوویە، پاشێ کەتیە ناڤ ئاینێ ئسلامێ. ناڤێ [بەرسیس] ژ دو خەبەران چێبوویە: بەر و سیس. بەر ب زمانێ یاهوودی یانێ کور، بەرسیس یانێ کورێ سیس. دبە ئەو ل برتوکان دا هاتبە نڤیساندنێ و فەقێ تەیران ئەوژ بەر پرتوکان وەرگرتی‌یە، ب شوڤا هەلبەستی گەلەك رند ل هەڤ ئانی‌یە، گەش کری‌یە و رەنگێ داستانێ یانێ ژی بەیتێ نڤیساندی‌یە ب کورمانجی].

دبە ب راستی ووسا ژ بوویە، لێ بوتا ڤی گۆتنێ پێویستە ئەدەبیەتناسێن کورد باش مژوولی لێگەرینا داستانا هەلبەستی‌یا فەقێ تەیران [بەرسیس] و [بەرسیسا] چیرۆکی‌بن، ل هەموو ئالی یانڤا هەڤ بکن و قەدر و قیمەتێ [بەرسیسا] وی نیشان بکن ل ژۆری من گۆت، کو گەلەك هۆزان و هەلبەستێن ب ناڤێ فەقێ تەیران ل ناڤ خەلقێ کورددا هەنە، چەند حەب ژ وان ل دەستنڤیسارێن ئا. جابا هەنە. م. ب. روودەنکۆ ل خەباتا خوەدا، یا کو من ناڤێ وێ ل ژۆرێ نڤیسی، هەر ناڤێ دو هەلبەستان دنڤیسە، ئەو دبێژە: [ل دەستنڤیسارا ئا. جابادا هەلبەستێن [ئەی ئاڤ و ئاڤ] و [ژ رەنگێ دلبەرا حۆری] هەلبەستێن فەقێ تەیرانن] [٨٨].

چەند هەلبەستێن فەقێ تەیران ل کوڤار و رۆژنامێن کوردی‌دا و بەرهەڤۆکێن فۆلکلۆرا کوردی‌دا هاتنە چاپکرنێ. خوەندڤانێن مە دەلال دەرهەقا وان دا دزانن من ب خوە ل ناڤ سالێن ١٩٣٤ - ١٩٣٥ - دا چەند حەب ژ زاری کوردێن نەحی‌یا ئاپارانێ یا ئەرمینستانا سوڤیەتێ وەرگرتیە و ئەز وان ل ژێرێ چاپ دکم.

**● دلبەر ●**

**ئەی دلبەرا گەردەن زەرێ**
**وای نازکا دێم قەمەرێ،**
**قامەت ژ مووما فەنەری،**
**وێران ئەزم مالم خراب.**
**ئەی دلبەر گەردەن لەتیف،**
**وای نازکا قامەت ئەلیف،**
**قامەت ژ رەیحانا خەفیف،**
**وێران ئەزم مالم خراب.**
**ئەی دلبەرا گەردەن زوزاج،**
**وای نازکا مسلێ زوزاج،**
**قامەت ژ رەیحانا قراج،**
**وێران ئەزم مالم خراب.**
**ئەی دلبەرا قامەت مسال،**
**وای نازکا دلێ هەژار،**
**تە ژ خاندنێ کرم بەتال،**
**وێران ئەزم مالم خراب.**
**ئەی دلبەرێ، وای دلبەرێ،**
**فەرهاد ژ دەستێ کەسەرێ،**
**ئاڤەك ژ ئاڤا کەوسەرێ،**
**وێران ئەزم مالم خراب.**
**ئەی دلبەرا گەردەن زراف،**
**دێم شووشەیە تژی گولاڤ،**
**ئەی دوختەرا بەژنا زراف،**
**وێران ئەزم، مالم خراب.**
**چاڤان کو هلتینی ب مەستە،**
**ئەو چەندیا مسری ب دەستە،**
**ل کوشتنا من تەب قەستە،**

**ویران ئەزم، مالم خراب.**
**تو ب قەستا من دکوژی،**
**تو ب کیفرا دل ناسوژی،**
**گەلەك سوتم، کرم رژی،**
**ویران ئەزم، مالم خراب.**
**گەلەك سوتم، کرم کەباب،**
**کریە ب من سەد رەنگێ خراب،**
**یا لەیتەنی کونتوو توراب،**
**ویران ئەزم، مالم خراب.**
**یا لەیتنی کونتوو ڤەخار،**
**وەی نازکا من تە ژ دوور،**
**بیهش کرم زلفێ دهوور**
**ویران ئەزم، مالم خراب.**
**پیهش کرم زلفێ درەش،**
**بسکێ سیاهـ، بهنێ دخوەش،**
**ئەی دوختەرێ، چاپك بمەش،**
**ویران ئەزم، مالم خراب.**
**بێ کێف کرم زلفێ درەش،**
**بسکێ سیاهـ، زلفێد قەمەر،**
**عەشق و موحبەتا من لسەر،**
**ویران ئەزم، مالم خراب.**
**سوتم، برشتم بێ حەساب،**
**لێ پرسی بو کرمە کەباب،**
**کریە ب من سەد رەنگێ عەزاب،**
**ویران ئەزم مالم خراب.**
**سبحان ژ شاهە ب تەنێ،**
**خالەك ل خالا گەردەنێ،**
**ئەز دین کرم، بەردام دنێ،**
**ویران ئەزم، مالم خراب.**
**ئەشقا مەزاج پەیدا بوویە،**
**ئیرول من دژوار بوویە،**
**هێڤی دکم حەقیقی‌یە،**
**ویران ئەزم، مالم خراب.**

ئەڤا هەلبەستا فەقێ تەیران [دیلبەر] بەرێ پێشین ل پرتوکا س. موڤسێیان دا ل ناڤێ ء زمانان کورمانجی [کن] ل سالا ١٩٣٥ ل ئێریڤانێ چاپ بوویە، من ئەوژ وێ پرتوکێ وەرگرتی‌یە چمکی ب فکرا من ئەو ئاسلی ژ دەستنڤیسارا فەقێ تەیران هاتی‌یە وەرگرتنێ. من هەر ل وێدا رێزێن بەندا ٨ گوهاستنە، دپرتوکا س. موڤسێیان دا ئەو رێز ب ڤی جوورەیی هات بوونە چاپکرنێ:

**ئەو ب قەستا من بکوژی**
**ئەو کافرا دل ناسوژی،**
**گەلەك سوتم، کرم رژی،**
**ویران ئەزم، مالم خراب.**

ل سالا ١٩٣٥ ـ دا ئەز چوو بوومە نەحی‌یا ئاپارانێ ل وێدەرێ کورسێن حازرکرنا ماموستایێن مەکتەبێ کوردان ڤەبوو. من ل وێدەرێ، ل کوندێ جاموشڤانا مەزن دا دەرسێ زمانێ کوردی‌و لیتێراتوورا کوردی‌ددا دەرسدارێن کورد.

هەما ل وی چاخێ من چەند هەلبەست ژ زارێ قاچاخێ کوکل، ٢٨ سالی، ژ قەبیلا روژکان، ل گوندێ سەنگەرێ، نەحی‌یا ئاپارانێ سەر ئەرمەنستانا سوڤیەتێ نڤیسین. ژ وان هەلبەستان من ئەڤ هەلبەست نڤیسی‌نە: [هەی ئاڤ، هەی ئاڤ]، [فەقێ تەیران و قولنگ]، [فەقێ تەیران و روژ]، [فەقێ تەیران و ئەڤینادل]، [فەقێ تەیران ژ دل را]، [فەقێ تەیران و بلبل]، [فەقێ تەیران و دلبەر]، ب فکرا من ب هەڤ ئانینا خوەڤا، ب کێش و قافی‌یا خوەڤا ب ل هەڤ هاتنا رێز و بەندێن خوەڤا ئەڤ هەلبەستانا نێزیکی ئەسلی نڤیسارا فەقێ تەیرانن. لەما

**ژی ئەز وان ل ڤرا چاپ دکم، کو خوەندەڤانێن مەیێن دەلال هاژ وان ژ هەبن.**

## ● هەی ئاڤ ●

**هەی ئاڤ، مال خراب، ب بەز،**
**قەوی ب فوور دکشی هەر ب ●ز،**
**شەواتا تو ل سەر، ووسا ژی ئەز،**
**هەرێ ئاڤ، تو ماشوقا دلێ مخوەیی،**
**نەشڤێتا قەلپێ مایی،**
**مەتلوو بەکی دلێ تەژی هەبی.**
**ئاڤێ گوت: هەی مال خراب، ل مە چوون قەلەم زەمان،**
**ئەم دخولخولن بێ قەیاس و دەمام،**

هاتن دونیایێ گەلەك پێغەمبەر،
ئەوان ژ مە نەکر پرس و هەوال،
پێغەمبەران ئاقل هەبوون،
ئەو هەوجێ پرسان نەبوون،
ئەوان ژ زۆر مەتلەب هەبوون.
فەقی گۆت: هەر ئاف و ئاف، هەر ئاف و هەر ئاف،
قەوی تێیی ب شەڤ و رۆژ ل سەر هەڤ،
تو سەوت ددی بێ قەلب و دەڤ.
ئەز موتاجم، تو هەواسی،
ژ ئولمداران ناقم قەلسی،
گۆتن ژ من را سەرفنازی.

## ● فەقی تەیران و ئەڤینا دل ●

نەرۆ دلۆ، دلێ بازی،
چ ژ حالێ من دخوازی،
بەسە بکی هەوار و گازی،
تە ئەز کرمە بەلەنگازی،
ئیرۆ سفەکە ژ هەر سڤانە،
ئەز خیالا دل دا مامە،
نزانم، شەرقێ هاتمە شامە.
نەرۆ دلۆ تۆ ب تفق،
تو رێوییی هەتا مفرق،
هەرۆ دلۆ، هەتا مفرق،
هەرۆ دلۆ، چرا ووسا دکەو گری؟
بەسە، بکێ شین و گری،
حەساب بتە ـ قەت نە ل ڤری
چرا ژ ئەڤنا زۆر دگری؟
برینا دلێ من ساخ و سلی،
ژ کەزەڤێ دا دخلی،
هەر دل بکە شین و گری.
دلێ من ئنسانێ بێ زمان،
ل من دکە هەوار و فەرمان،
گەلۆ ژ بۆ چ ئەز ل ڤر نەمام؟
سەدو پێنج سالێ من بوون تەمان.
ڤێ سەیادێ من دا بوو،
ل من بەحرا مەزن رابوو،
هەرۆ دلۆ ژ خەوێ رابە،
خەما دل وێ بەلاڤ بە،
ژ بەلقیزایێ نایێ جابە،
کۆڤیا هلکەڤ خەملی سەردا،
کەچك هات، رابووم بەردا،
گەلۆ کێ ژ دلێ من خەبەردا،
شەربەتا لەوزو کلامان
دادەست خاس و عامان،
دلێ من ئنسانێ بێ زمان،
ل من دکە هەوار و فەرمان.
بوو پاییز ل ڤان دەران،
خەزان زەر بوون سەری داران،
سەفا نابە ل وان دەران.
دلۆ چما توها خواری،
تو ژ منرا بێ ئعتباری،
گەلۆ هەیە ئنسانێ نەمری؟

## ● فەقی تەیران و دلبەر ●

وای دلبەرا دیم ب شەمال
بۆ تە دگەرم وار ب وار،
هەر بۆتە بوومە خراب مال.
تو دیلبەرا ئەسل زادە،
تە ژمن بری یە چاخ و وەدە،
قنیات دل دا بوویە بێ سەودە.
تو دلبەرا منە عەنەلا،
ئیرۆ قەوی ژمن بوویی جودا،
ئەز مامە بێ هش و بێ سەودا.
تو دیلبەرا دەرێ بێ قەیایێ،
ب حوسن و جەمال تفقی روو دونیایێ.
قەوی ئیرۆ من چەند کری یە،
دەرهەم ل خەلقێ زەف کری یە،
سێ سەد شەست بەیت حازر کری یە،
ل ناڤ خەلقێ بەلاڤ کری یە،
هاڤەکی رند ل خوە کری یە.

## ● فەقێ تەیران و قولنگ ●

هەی قولنگۆ خوە نەوەستینە،
پەرو باسکان هە هلینە،
هەرە، ژ تەبیعەتێ ژ من را گلیا بینە،
ئیرۆ ل سەر رییان ئەز ریویمە،
تو ل هەوا خوەش جباربە،
سەر گازو گێدووکا بلند خواربە،
هەما ژ دەردێ دلێ من هشیاربە.
هەی مال خراب، تو گوداری کە،
پەرو باسکان ل سەر من سیکە،
من ژی گەل خوە ریوی کە،
چەند گلییان ل من سافیکە.
مال خراب ل من بکە قیرین،
دل و جەگەرا من تەڤ بوارین،
ئەزم ئیرۆ بێ سەودا سەرین.
گەلەك رەفێن مینا تە ل من دا بهرین،
هەی قولنگۆ تو دفرێ ل دونیایێ،
هەرە جهایێ بدە عەینەلایێ،
بێژە فەقێ تەیران نها نایێ.

## ● فەقێ تەیران و رۆژ ●

رۆژ هلات و ئاڤا بوو،
ئەرش و ئەسمان جیکی راوەستابوو،
دونیا ب تەبیعەتێ شێن و ئاڤابوو،
هەی رۆژا سۆر ب رەنگێ خوەڤا،
بێ‌تە هێشین نابی گول و گیها،
تەنین بەریوی قەت رێ نابەت،
تو رۆژەکە ئامن و تاقەت،
بێ تە ناژین ئنسان و مەخلوقەت،
ب تە دبن هەر گاف فریقەت.
تو بلندی، هەر گاف بەروازێ،
ئەرد ژ تە هەرگاف دزێ،
تو مینا پێلێت ئاگر ل ئەسمان،
گەرمێ ددی دەشت و زۆزان،

## ● شێخێ سەنعان ●

سەنعانیان شێخەك هەبوو
ئەو ئاشقێ ب خوە خوە بوو،
قەت مێلە د دنیایێ نە بوو،
دوور بوو ژ ڤێ مشولخەتێ،
دوور بوو ژ ئەڤ دنیا فانی،
پر دگری، کێم دکەنی،
کول بوو ژ بەر سوجدە ئانی،
د کارو زەوادا ئاخرەتێ.
وی هەر زەوادە کار دکر،
زکرەکی بێ هەژمار دکر،
ژ دنیایێ ئفتخار دکر،
دوور بوو ژ هەر چ شبهەتێ.
دوور بوو ژ ئەفالێ ب شەك،
ژ ئەمرو بکر خوشك،
ما کەس ناکت ل نك،
ناکت قەبوول ڤێ خەیبەتێ.
ناکت قەبوول ڤان خەبەران،
مەدحێ جڤان و دلبەران،
ما کەس خەبەر ناکت پێرا،
بەحس و قسێ محنەتێ.
دوور بوو ژ بەر مناهییان،
نەد هات عەیدو شاهییان،
ژ شەرما سەلوات و چێیان،
شیرین دهات تاعەتێ.
تاعەت دکر دایم مەدام،
گە ژ قەود، گەژ قیام،
حەفتێ و حەفت سالێ تەمام،
خالی نەبوو ژ خزمەتێ.
هەر خزمەتا ب خوە دکر،
زکرێ مەزن ژی پێ دکر،
ب جێهییان خەلق چێ دکر،
دانی ریا هدایەتێ.
هەر چێ ل شێخ گوهدار دبوو،
دنیا ژ چاڤان سەر دبوو،

ئاخرەت ب ویرا یار دبوو،
ژ وەزو پەندو شیرەتێ .
شیرەت و پەندا حەکیمان،
خەبەرێ پیرا ئەزی مام ،
دلبەرێ ئەهلێ حەلیمان،
کەس نەدکت قیمەتێ .

ئەمرێ وی ب حەد جەما بوو،
یەك موویەك رەش تێ نەبوو،
حۆریك دیەو تما بوو،
رۆهنی‌یا فەندێ کەتێ .
رۆهنی‌یا فەندێ کەتێ ،
حوری‌یا بەگرا گهشتێ ،
دل سەر بانێ کەنشتێ ،
دکو کەچ بان دکەتێ .
ب تەنێ کەچ فەخوەندی،
پەردێ ژ بەر خوە هلتینی ،
شێخ د خوونێدا دبینی ،
جام و تاسەك مەی ددتێ .
خەمرو شەراب پر دکە،
شێخ د خوونێدا فر دکە،
نەزەر ل یا دێم دور دکە ،
دین بوو ب نیڤا خەلڤەتێ .
دنیڤا خەلڤەتێ ئەو دین دبوو،
تژ ی دەماخ خوون دبوو،
شهبا سپی رەنگین دبوو،
ئەو حال و رەنگ قەت ژ ێ نەتێ .
نایێت ل شێخ ئەڤ حال و رەنگ،
عەیبە ل وی ئەو ناڤ و دەنگ،
پر جۆش دبوو ژ دەست زلفێد شەنگ،
ئتبەر ب دنیایێ خەت .
ژ زلفێد رەش دین بوون گەلەك،
کەزەما کەڤن رەش هەلەك،
فریا دێ شێخ چوونە فەلەك،
ئاهـ و فغان ژ ی نەتێ .

ئاهـ و فغان دەر بوون هەزار،
هنگێ هەبوو دەروێش و یار
هەمییان ل شێخ کر پرسیار،
باژارو ئەهلێ هێشەتێ .
شێخ گۆت وان قیر قیرمەکن،
زکرێ خوە ئیرۆ پر مەکن،
کێفێ ل من بێ سەر مەکن،
خوەش نینە سەوتا ژ وەتێ .
شێخ ل خوە نەکت ستران،
ئاشـــکـــەرا خوە گۆت یاران،
ئاهـ ژ دەستێ دۆهتا کافران،
برمە دینێ شەرکەتێ .
بێ مەزهەب و بێ دین کرم،
بێ خوەندن و یاسین کرم،
ژ یارو بران شەرمین کرم،
واردەك خێلا من نەتێ،
لێ نەشێم وەردان بخونم،
بژەنگێ نازك دبینم،
دین دبم ور دمینم،
دل ژ من بر قامەتێ .
قامەتا سەکران و مەستان،
حوری‌یا لۆلۆ د دەستان،
برمە دێرا خاج پەرستان
خەلقی‌یا خەما خانەتێ .
هەم نوو کرم، هەم باد کرم
کو وێ ئەز ئیسای کرم،
ژ ڤێ تەریقەتێ دەرکرم،
کافر کرم بێ مروەتێ .
حوسنا کەچێ بوو مەزهەرە،
ئەو حۆری‌یا دێم قەمەرە،
شێر دی بوو، جهان چوو بەر،
شەم و ئەدەب قەت ژی نەتێ .
شەرم و عەدەت چوو وێ دەمێ،
نالی ژ تیرا شەرمێ تێ،

تو گمرم دکی سەرو بنە،
تمغو رموور ب تە دبن خنج.

پێویستە ل ڤرا چەند خەبەران دەرهەقا داستانا فەقیێ تەیران [شێخێ سەنعان] دا بێژم.

داستانا فەقیێ تەیران [شێخێ سەنعان] بەرێ پێشین ل وەلاتێ سوڤیەتستانێ دا هاتی چاپکرنێ. ل سالا ١٩٦٥ ـ دا م. ب. روودەنکۆ تێکستا نڤیسارا فەقیێ تەیران [شێخێ سەنعان] ب تەرجما رووسی و پێشگۆتنا ب لێنهێرین و سەرداری‌یا من چاپکر.

ژ بەر کو هەتا نها داستانا [شێخێ سەنعان] نە هاتی‌یە چاپکرنێ ب حەرفێن لاتینی، من ل ڤرا بریار کر، کو هەر ب تەنێ چەند پارچێن وی چاپ بکم بۆنا خوەندەڤانێن مە دەلال، کو ئەوهاژ ب تە هەروقەیدێ نڤیسارا وی بن من ل ژ ورێ گۆت، کو ناڤەرۆکا داستانا [شێخێ سەنغان] مینا ناڤەرۆکا بەیتا دمدم [دۆدا گورجا] نە، یا کو ل بەرهەڤۆکا [فۆلکلۆرا کورمانجی] دا چاپ بوویە. یێ دخوازم ڤێ یەکێ بزانبە، دکارە وان بەرامبەری هەڤ بکە.

بوویە کەنینی ئالەمەتێ،
ئاڤێت کراسێ روومەتێ.

ل ناڤ کۆمێن دەستنڤیسارێن کوردیێدا یێن کتێبخانا سالتیکۆف شێدرین دا دەستنڤیسارەك هەیە، ب حەرفێن عەرەبی، ژێرا دبێژن [هەزا] [یانێ ئەڤا] بەیتی فەقی تەیران ب ئاڤێرا خەبەر دایە.
ئەڤا تێکستا ژ دەستنڤیسارا حەرفێن عەرەبی چ. س. موسا عەلیان هاتی‌یە وەرگرتنی:

● هەزا ●

بەیتا من پر خوەشە، گوهـ بدن، خودان کەمال ئەی ئاڤ و
ئاڤ، هەی ئاڤ و ئاڤ،
ماتو ب عەشق و موحبەتێ،
مەوجێ پێلان داڤێ پێلان،
بێ سەکونی و بێ رەحەتی.
بێ رەحەتی و بێ سەکنەتێ،
یانە ئەشقا یا خوە خوەنەتی،
یان شهبەتا قەلبێ منی،
ژ ئەشقا تا تەبتی،
ژ ئەشقا تو تێ‌یی هەی،
هەتی ب کو کەنگێ هەی بێ‌ی،
ژ من را بێ، حەیرانا تەبم،
دا ئەز بزانم قسەتێ.
دا ئەز بزانم ڤێء سرێ،
ژ هندکی هەتا برێ،
ژ مەعنەیا ڤێ گور ـ گورێ،
ژ کێ‌را دکێ ڤێ تاعەتێ.
ژ کێ‌را دکێ زکرێ ب حال،
قەت کشکشی ناکی بەتال،
تەشبی‌یە من رەحەت و عەمال،
قەت ب شەڤ و رۆژان خوە نەتێ.
لۆ شەڤ و رۆژان بێ خەوی،
ژ محنەتێ ل یەك د تەوی،
شەڤ تاری‌یان قەت ناحەوی،
ژ ئەمری ب لەز کەتی.
ژ ئەمرەکی تۆتێ‌ی ب لەز،
سەودا سەری تەشبی‌یە ئەز.
تو وەها دهەری ڤێ خزمەتێ،
خزمەت دکی بێ پێ‌و دەست،
چەند دکی چوونا گوهەست،
خودێ نەگۆ گاڤەك قەوەست.
دایم دچێ، دەنگێ تەتێ،
دەنگێ تەتێ ب رۆژ و شەڤ،
تاعەت دکی بێ قەلب و دەڤ،
پێل رادبن ژ مەوجێ کەف،
سەیرانە ژ رەنگێ قودرەتی.
گەهـ ـ گەهـ سپی تەشبی‌یە شیر،
مسلێ تەقەت ناچن چو شیر،
ئاڤێ‌ها د هەری یار تێ یە بیر،
مێلا حەبیبێ ب چوونا تەتێ.

لازم ته مه‌حبوویه‌ك هه‌یه،
یان مێل و مه‌تلوویه‌ك هه‌یه،
یان دۆست و مه‌قسوده‌ك هه‌یه،
یان سه‌رع و مه‌زمۆزه‌ك هه‌یه،
لۆ بێ لباس و که‌سوتی،
لۆبێ لباس و تازی‌یی،
د شێرو ره‌قس و گازی‌یی،
ژ کێ‌را دکی ئه‌سقێ بازی‌یی،
ره‌مزان و خوه‌ش ئه‌شاره‌ت.
ڤان ته‌سبیهان ژکێ‌را دکی؟
ره‌مزو سه‌وادان ڤێك را دکی،
حه‌می‌یان ژ بال خوه‌را دکی،
دگه‌ری ژ مه‌هه‌لا غوربه‌تێ.
دگه‌ری ده‌ڤێ پره دنێ،
قه‌ت نانڤی، ناسه‌کنی،
ره‌هـ شبهه‌ته قه‌لبێ منی،
ژ محنه‌تا نه‌و زه‌حمه‌تێ.
بێ قه‌م و قیل و قالا ب سری،
ژ من را ب لفزێ حال و ب بێژ،
هه‌ر مموهاو دال ب بێژ،
مننه‌ت و به‌یانا کاخه‌تێ.
ڤێ کاخه‌تێ ئسبات بکه،
قه‌یدو سر ئختیار بکه،
قه‌نج ڤێ سرێ بنیاد بکه،
دا ئه‌م بزانن ره‌بێ به‌نی.
دنیاو ئه‌سلێ سه‌ر ته‌مێ،
ئاڤێ بری ڤێ عالەمێ،
تو هادسی یان قودسی،
یان تو نزانی حکمه‌تێ.
گه‌ر چ نه مه‌شروهـ ئاڤ سووخه‌نی،
رۆژه‌کێ ژ بنیادا مه‌زن،
به‌هنا قه‌ده‌م ژی هاته من
یانێ ژ بنیادا ده‌لال.
ئاڤنگێ دبێژه ئاڤ زه‌لال،
بۆری، ل من کو چه‌ند سال،
قه‌ت که‌س نه‌کر ئه‌ڤ ره‌نگ سه‌وال.
هه‌تا نها ڤێ سه‌حه‌تێ.
هه‌تی نها نه‌ڤێ ده‌می،
جابه‌ك نه‌بوو ژڤێ عالەمێ،
عه‌بده‌ك ژ پشتا ئاده‌می،
ب فکر دا هه‌والێ شه‌تی.
گاڤا فزینا شه‌ت زوو د چێ،
هنگێ خودێ دانی جنین،
ئاده‌م نه‌کر پرسه‌ك ژ من،
ژ ئه‌نبی‌یاو ئۆمه‌تێ،
فه‌قی دبێت ئاڤا شه‌تێ.
پێغه‌مبه‌ران ئاقل هه‌بوو
قه‌ت هه‌وجه پرسێ نه‌بوو،
وان ده‌ست گها بوو محبه‌تی،
ژ سحبه‌تا سرقه که‌تێ،
پێغه‌مبه‌ران زانی شخال،
عه‌یبه ل بال ئه‌هلێ ئاقل،
تفتیش بکن مه‌عریفه‌تێ،
مه‌عریفه‌تێ ته‌ڤ بکن،
پرسێ ژ بۆنا پێش بکن،
قه‌نجی ڤێ قسێ تفتیش بکن،
ژ عارفان کراهه‌تێ.
خه‌لقێ خودێ ئاقل کری،
هه‌م عارف و که‌مال کری،
نووره‌ك د دل دا هلکری،
ئه‌سلێ قسا وی پێ که‌تێ،
ئه‌ی مسلمان ئه‌لم و خه‌ت،
مه‌جنوونه‌کی حه‌یوان سفه‌ت،
ته‌فتیشا پرسان ئه‌و دکه‌ت،
لۆما کو لێیه ل ئۆمه‌ته.
پرسا فه‌قی بۆ چ نه‌بوو،
لارا د فرقه‌تێ هه‌بوو،
عه‌رشێ خودێ ل سه‌ر ئاڤ ڤه‌بوو،
ئاڤێ گه‌لۆ دبیرا ته‌تێ.
ئاڤێ جه‌واب دایه سووخانێ،

ـ زمان حال وی گوٚتی من ،
من رەمزو سر ژ شاهێ مەزن ،
سبحان ژ وی سلتەنەتێ .
سبحان ژ مەعبوودێ ل بەر ،
کی دی ژ خودێ کت خەبەر ،
ئەم جارەکی ئینانە دەر ،
گەنج بوون دکەنیزا قودرەتێ ،
گەنج بوون د کەنیزا ئەقدەمێ ،
با خوە ژ ئەشقا ئادەمێ ،
ئینانە کارێ عالەمێ ،
زاهر کرن ڤێ سوورەتێ ،
زاهر کرن ئەم چار باکرە ،
ئاڤ و هەوا ئاخ ئاگرێ ،
هەوان هەمی ژێ چێکرە ،
دارو نەبات و دێ قیمەتێ ،
دارو نەبات و لعال دوورە ،
حەیوان و ئەنساف د پرە ،
تەیرو تەور بەهاریو بەر ،
تەرکیب کرن ژ نەتەفەتێ ،
تەشبیە مەنا قەرجین ،
ئینسان ژ تینێ خارجین .
لوٚچێن ژ نارێ مار جین ،
روٚژەك ژ من یەك تەبیەتێ ،
ئەم چار تەبعەتان ڤێك را خەلدین ،
هن ئاتشین ، هن باردین ،
ژ بەحرا هەوا پێ والدین ،
مەلبوس کرن ب ڤێ وجهەتێ ،
ب چار جهان ئەم لابن ،
قەدیم نی یە ، ئەم خادسن ،
لوٚما ژ تینا بابسن ،
هندی د خوازن رفعەتێ ،
هندی مێلا ئەفراز دکن ،
هندی دشین گازی دکن ،
ئەم جارەك بینن رەویعتێ ،
جارەك بینن ئەم چار خەهەتێ ،

بێ مسلمەت ناگەرەتێ ،
ژ خوشیەتی نالەرەتێ ،
جودا کرن ژ وەسلەتێ .
ژ وەسلەتێ جودا کرن ،
هەتی قەیام سەودا کرن ،
سەر کشتە بوون د هەزرەتێ ،
راستە قەوی ئەڤ مێلا ،
ئەسلێ قەسێ زانی مەلا ،
هێنا کو بوو قال و بەلا ،
مابوون نەبوون د هزرەتێ ،
دهزرەتا مە هوون نەبوون ،
لە لاتفی بێ دەستە بوون
دخزمەتا با خەوە خوە بوون ،
هەتان روٚژا خیرەتێ .
ئەی هوون وەرن ، لێزم وەرن ،
جینارو خەلقێ هێشەتێ ،
هوون رایەکی ل من چار بکن ،
ئیروٚ قەوی کرینا من تێ ،
ئیـروٚ قەویـن مە تیـن گریـن ،
سوٚسن دەرگان خەیرین ،
سەد حەیف ل لێڤێ شەکرین ،
ئیروٚ ڤەناخون شەربەتێ .
لێڤێد لەعل و شەکر ،
کێم بوون ژ وان دورو خەبەر ،
سەد ئاخ و کوٚڤان و کەسەر ،
حەیف عەین لام چوون ژ هجرەتێ ،
حەیف عەین و لام ژیەك نەبوون جودا ،
حەزن و گرین دیسان تەدا ؟
ئەم رازین ژ ئەمرێ خودا ،
هەر چێ ژ دەرگێ تەتێ ؟
هەر چ دکە ، ئەمیر دکە
داخان د قەلبان بیر دکە ،
خێرو شەران تەقدیر دکە ،
سوٚتم ب نارێ فرقەتێ .

# لە نێو فۆلکلۆری داب و نەریتی کوردەواری دا

● عومەر ئیبراهیم عەزیز ●

فۆلکلۆر بریتی‌یە لە کەلەپووری هەموو نەتەوەیێك لە نەتەوەکانی سەر ئەم رووی زەمینە.

واتا: ئەو کەلەپووره رەنگاورەنگەیە لە ناوباری ژیانی راستەقینەی میللەتـە چەوسـاوەکـانی ئەم جیهـانـەی ئێمـەی تێـدا ژیـاوین هەڵ قولاوەو، رووداوی ژیانی رۆژانەیان بووە کە لە ناو رۆڵەکانی نەتـەوەکـەیـان دا رووی‌داوەو، هەر لەو کات و شوێن دا بەقسـەی رەوان و سەرزاری‌و رەمـەکی‌و وتـەی شیـرین و پرسـۆزو دڵ فرێن گێراویانەتەوە، لەم زار بۆ ئەو زارو لە باوکەوە بۆ کورو لە دایکەوە بۆ کیژ، ئەم گێـرانـەوەیـەش بەشێوەی هۆنینەوە بوە، یاخود بەشێوەیێکی ئاسـایی یا ئەوەتـە بە هەر شێوەیێکی‌تر بووبێت گێراویانەتەوە، تاکو گەیشتوونە ئەم کاتەی کە ئێستا ئێمەی تێ‌دا دەژین.

بەڵام لەبـەر ئەوەی ئەو گێـرانـەوەیـە بەگـەلێـك شێوەو جۆر بووەو رووی‌داوە، بۆیـە بەهـۆی ئەو گێـرانـەوەیـە ـ لەنێـوان نەتـەوەیـەك و نەتـەوەیـەکی دی‌دا جیـاوازی پەیـدابـووە، چونکـە گومانی تێدا نی‌یە گێـرانـەوەی نەتـەوەیێـك لەگـەڵ نەتـەوەیـەکی دی وردە جیـاوازییەکی هەردەبێ، ئەمەش دەگەرێتەوە بۆ باری پێش کەوتن و دواکەوتنی ئەو نەتەوەیە.

هەروەك رووینشـە کەلـەپـووری نەتـەوایـەتی دەربـرین و شێوەی ژیـانی کۆنی پێش پتـر لە سەدان ساڵی پێش ئێـسـتـای باوو باپیـران دەردەخات، پلەی شارستانیەتی‌و خوو رەوشت و بیروباوەریان پیشان دەدات.

لەمەش بۆ ئەمرۆکەی ئێمە رۆڵێکی گرنگ و شوێنێکی دیارکراوی هەرە بەرزی هەیە بۆ ژیانی رۆژانەی ئەوەی نوێ‌و نەوەکانی دوارۆژیش. (١)

(زۆر لە زاناکانی جیهان ئەوەیان دووپات کردوتەوەو بە کۆمەڵانی خەڵکیـان سەلمـانـدوە کە فۆلکلۆر لەگـەڵ بوونی مرۆڤـەوە سەری هەڵـداوە، هـەر لەبـەر ئەوەشـە بیـرونـەریتی کۆمـەلایـەتی کۆن و کەلەپووری نەتەوایەتی بەپێی پێش کەوتنی شارستانیەتی‌و قۆناخەکانی مێـژوویی پێش کەوتـوون و هەر لەو کاتـەش دا ئەو گەلـە گەلی گێـروگـرفـت و ناخـۆشی‌و دەردەسـەری‌و ئازاری ـ چێشتـووە، فۆلکلۆریش لەگـەڵ گەشـەکـردنی گەلەکەی خۆی‌و لە پێش کەوتنی‌دا بەسـەر ئازارەکانی ژیان دا، پێش دەکەوێ‌و گەشە دەکات». (٢)

(ئەلیکسەندەر کراب)یش لەم ڕووەوە دەڵێ: فۆلکلۆر زانستێکی مێژوویییە، بۆیە دەبێ ئەو زانستە بپارێزرێت و ببێ بە بەردی بناغەی ئەدەبی پێشکەوتوو)[٣]

لێرەدا لە وتەکەی (ئەلیکسەندەر کراب)ەوە بۆمان دەردەکەوێت کە هەوڵ و ماندووبوون و خۆخەریك کردن و تەقەلای هەمیشەیی بێوچان لە پێناوی پاراستن و کۆکردنەوەو بڵاوکردنەوەو لێکۆڵینەوەی زانستانە بدرێ بۆ گەیاندنیان بە ڕۆڵەو گەلانی تری جیهان.

د. عیزەدین مستەفا ڕەسوڵ لەبارەی دەوڵەمەندی فۆلکلۆری کوردییەوە دەڵێت: «گومان لەوەدا نەماوە کە نەتەوەی کورد لە فۆلکلۆردا یەکێکە لە نەتەوە هەرە دەوڵەمەندەکانی جیهان، هۆی ئەمەش تەنیا ئەوە نییە کە ئەدەبیاتی نووسراو نەختێك درەنگ لە ناو کوردا پەیدابووبێت. بەڵکو ژیانی تایبەتی گەلی کوردو وینەی جیاوازو گۆرانی زووبەزوو لەم وێنانەدا، بوونەتە هۆی ئەم دەوڵەمەندییە، هەروەك بوونی چەند دیالیکتێك هێندەی تر دەوڵەمەندی کردووە. هەروەها زروفی تایبەتی وای کردووە کەبەشی زۆری ئەدەبی میللی بەناوی خاوەنەکەیەوە بڵاونەبێتەوەو ئەوەش دەماودەم و پشتاوپشت بمێنێتەوەو بچێتە - سەرگەنجینەی فۆلکلۆرمان».[٤]

## فۆلکلۆری نەریتی کۆمەڵایەتیی کوردەواری

ئەم بەشەی فۆلکلۆرە هەموو خوو ڕەوشت و هەڵس و کەوتێکی کوردەواری دەگرێتەوە کە بەزۆریش لەسەر بنچینەی هەرەوەزی کۆمەڵایەتی - دامەزراون.[٥]

هەر لە سەرەتای ژیانی ڕۆڵەکانی میللەتەکەمان و تاکو ئەمرۆکەش هەندێکیان هەروەکو خۆیان ماونەتەوەو لە دێهاتەکانی کوردستانمان پەیرەوی دەکرێن و، هەند - ێکیشیان بەرەو نەمان دەچن و، شتی تر شوێنیان دەگرێتەوە.[٦]

هۆی نەمانی هەندێ لەم خوو ڕەوشت و هەڵس و کەوتنانە دەگرێتەوە بۆ ئەو گۆرانکاریی و پەرەپێدان و پێش خستنی تەکنەلۆژیایە لەم لایەنەوە. هەندێکی تریشیان لەبەر گرنگییان هەروەکو خۆیان ماونەتەوەو پارێزراون.

ئەو نەریتانەی کە باوبوون لەکاتی جووت و تۆودان و دروێنە کردن، ئێستا ئەو ئامێرە نوێیانە جێگای کەل و پەلە کشتوکاڵییە کۆنەکانی گرتۆتەوە، لەگەڵ ئەم شوێن - گرتنەوەیان دا خووڕەوشت و نەریتەکانیشیان لەگەڵ خۆیاندا لە ناو بردوە.

بەڵام ئەو نەریتانەی کە ئەمرۆکە ماون و هەربوون جێگای شانازیی و سەربڵندییە بۆ ئێمە کە لە ناو میللەتانی ترەوە پێیانیان دیاربین و مۆرکی تایبەتییان هەبێ و پێیان لە نەتەوەکانی تری جیهان جیابکرێنەوە.

لەوانە: [شایی و هەڵپەرکێ بەهەموو جۆرەکانییەوە، هەندێ کاری کشتوکاڵی و باروبوو یارمەتیدانی یەکتری و زبارەو ڕێز لە یەکتری گرتن و بەزەیی هاتنەوە بە بچوك و جەژن و گەردەن ئازایی و نۆماستانەو فرۆو گۆشت بەخشین و ئامۆشۆکردنی یەکتری و سەر لە یەك دان و دەیان نەریتی تری بەجێ].

هەندێ لەم نەریتانە تایبەتین بە ئافرەتان هەروەکو (ئەو جۆرە ئاوازو گریانانەی کە بۆ مردوو دەگوترێ و پەروەردەکردنی منداڵ و کۆروکانی «جل شوشتن»و - نان کردن و گەلێکی تریش).

وەهەشیانە تایبەتە بەپیاوان وەك: (باروبوو لێقەوماوی و خوێن خۆش کردن و جێبەجێکردنی پیاوکوژی (مەسەلەتی)و ئاهەنگ گێران و بەزم و گەرەلاوژەی دیوەخانانی شەوانی درێژی زستانان و چەندەها نەریتی تر).

ئەوەشمان لە بیر نەچێت هەشیانە بە هەردوولا بەشداری ئەم نەریتە دەکەن و بەهاوبەشییەوە سازی دەدەن وەکو: (ژن هێنان - بووك گواستنەوە - وبەزم و گۆرانییەکانی شایی و هەڵپەرکێی ڕەشبەڵەك و مردو بە ڕێکردن و پرسەو ساوارکوتان و ئامۆشۆو سەرلە یەکتریدان و ڕێز لە یەکترگرتن و بەزەیی هاتنەوە بە گچکەو جەژن و گەردەن ئازایی و هەندێ کاری کشتوکاڵی و دەیان نەریتی تری هاوبەش).

بەپێی ئەم لقانەی خوارەوە فۆلکلۆری نەریتی کوردەواریمان دابەش کردووە کە ئەمانەن:-

(١) منداڵ بوون و چۆنێتی پەروەردەکردنی تاکو هێنانە خوارەوەی لەسەر لانك (بێشکە).

(٢) ژن و ژن خوازی (ژن هێنان یا ژن خواستن یان بووك گواستنەوە) وبەزم و گۆرانییەکانی.

(٣) شایی و هەڵپەرکێی و گۆرانیی و جۆرەکانی لە کوردەواریدا.

(٤) کاسە دراوسێتی یا کۆتکە جیرانە.

(٥) نان کردن و گێرانی بەزمەکانی سەر تەنوور.

(٦) ساوارکوڵاندن و پێویستی‌یەکانی.
(٧) ساوارکوتان و بەزم و گۆرانی‌یەکان.
(٨) دەستار لێ‌کردن و گۆرانی‌یەکانی لەکاتی ئەنجام دانی ئەم کارە.
(٩) ئاموشۆکردن و سەر لە یەکتری‌دان.
(١٠) نەبوونی‌و لێ‌قەوماوی‌و باروبوو (پیتاك)
(١١) رێز لە یەکتری‌گرتن و بەزەیی هاتنەوە بە گچکە.
(١٢) کچ نیشان کردن هەر لە گچکەییەوە بۆ کوڕی منداڵ یا ـ «بن پیشك».
(١٣) باوی ژن و ژن خوازی لەناو هەندێ لە خێزان و هۆزی کوردەواری‌دا.
(١٤) جل شوشتن یا (کۆروکانی).
(١٥) نوماستانەو فرۆی مانگا «چێل».
(١٦) گوشت بەشینەوە یا خێرکردن.
(١٧) ئاهەنگ و بەزم گێران و گەرەلاوژەی دیوەخانانی کوردەواری.
(١٨) کارە کشتوکاڵی‌یەکان و زبارەو دەستەوایی‌و... گەلێکی تر.
(١٩) جەژن و گەردن ئازایی‌و جێ‌بەجێ‌کردنی دوو بەرەکی‌و رکەبەرایتی نێوان یەکتری.
(٢٠) خوێن خۆش کردن و چارەکردنی پیاوکوژی «مەسلەتی»
(٢١) مردن و چۆنێتی بە رێ‌کردنی پرسە «تعزیة».[٧]

داب و نەریتەکانی کۆمەڵی کوردەواریمان مۆرك و رەسەنایەتی‌یەکی نەتەوەیی تایبەتی خۆی هەیەو زادەی باروودۆخی هەزارەها ساڵی ئەم کۆمەڵگایە. زۆر لەم نەریتانە وا خەریکە رۆژیان ئاوا دەبێ لەنێو کوردەواریداو لای نەوەی نوێمان. دەچنە دوو توێی لە بیرچوونەوەوە.

یەکێك لەوانە داب و دەستووری شایی‌و زەماوەندی کوردەواری‌یە، کەوا ئێستا بەرەو کزی‌و نەمان دەچی‌و (شهر العسل ـ مانگی هەنگوینی) لە شارەکاندا جێگای دەگرێتەوەو، پاشماوەیەکی کەمی رواڵەتیی نەریتە دێرینەکەش ناوبەناو لە لادێکان دا بەرێوە دەبرێ بۆ گەرم کردنی کوڕی شایی‌و هەڵپەرکێ.)[٨]

ئەمەش نموونەیەکی ئەو گۆرانی‌و بەستانەیە کە لەکاتی شایی‌و هەڵپەرکێی کوردەواری‌دا گوتراون، ئەمانەن هەندێکیان. ئەو گۆرانی‌و بەستانەی کە لەکاتی شایی‌کردندا گوتراون، ئەمانەن هەندێکیان:ـ

دەی دەی دەی دەی
یەك دێ لۆ گۆ وەندی
خالیق بینای بەشیری
عەشقی کیژەکی لێدام
بە دەست و بە کەوگیری
یارم بە کێ دەشپاند
بە خانزادێ هەریری
دەی دەی دەی دەی
لۆت نەمام و لۆت نەمام
لۆت نەمایمە هەی بابە
شەدەکی لەسەری نا
وای لێی دەدا قولابا
چەند جاعیلی لە دێ‌دا
جەرگیان بویتە کەبابا
چەند دەروێشی کەشکۆڵ دار
دەرۆن کەشکۆڵی نابەن
چەند حەجاجی لەرێی حەج
لەبیریان کردیە کابە

لەگەڵێ جارانی تریشدا بەسەر وەرزەکانی ساڵ گۆرانیان گوتووە بەتایبەتی بەسەر ئەو وەرزەی کە بووکەکەیان لێ‌گوازتەوە، هەروەکو لەم نموونانەی خوارەوە بۆمان بەدیار دەکەوێت.

بایێ شەمار لە گەروان دێ بە نارە نار
دایکی کیژان ماینێ عەدار
کیژ بالیفەو کوڕ دەچتە پار
* * *
بایێ شەمار بە هاوینێ
دەیدا لە رەندەی جۆخینێ
خەو خۆشەو لەگەڕ هەمینێ
* * *
بایێ شەمار بە پاییزێ
دەیدا لە پەڵکی دار گێزێ
خەو خۆشە لەگەڕ مامزێ
* * *
بایێ شەمار بە بەهارێ
دەیدا لە پەڵکی هەنارێ
خەو خۆشە لەگەڕ خەزارێ
* * *

بایێ شەمار بە زستانێ
ئەیدا لە پەلْکی دارانێ
خمو خۆشە لەگەر نازدارێ
وەگەلێ کاتی ترا کەبووك دەگەیشتە جێو لە ماڵەوە بووکانە بووکانەیان

بووکانە بووکانە بووکێ
ماینێ بووکێ زەردە بووکێ
سەر زینی لەوەندە بووکێ
قوناخمان دەربەندە بووکێ

* * *

ماینێ بووکێ گێ هەسانە بووکێ
سەر زینی گۆر باتمانە بووکێ
قوناخمان جاستانە بووکێ

* * *

بەقورە بەقورە بووکێ
دینگاوە بەقورە بووکێ
گەردەن سوسنێ دورە بووکێ
پیرۆزبێ لێت کورە بووکێ

* * *

بە ئاوە بە ئاوە بووکێ
بەرزەوار بە ئاوە بووکێ
گەردەن سوسنێ ساوا بووکێ
لێت پیرۆزبێ زاوا بووکێ

* * *

بە بەردە بە بەردە بووکێ
کەلەشخان بەبەردە بووکێ
گەردەن سوسنێ زەردە بووکێ
لێت پیرۆزبێ پەردە بووکێ

سەرچاوەو پەراوێزەکان

---

(١) عومەر ئیبراهیم عەزیز، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە (١١٢)، کانوونی یەکەم/ ١٩٨٦، فۆلکلۆری کوردی لە ڕوانگەی زاناو ڕۆژهەلاّتناسان و نووسەرانی کوردەوە، لاپەڕە: ٣٠٧

(٢) محەمەد تۆفیق ووردی، نماذج من التراث الشعبي الكردي، چاپخانەی الغري نوێ ـ نەجەف، چاپی یەکەم، ١٩٧٥، لاپەڕە: ٤

(٣) گۆڤارێکی خوێندنکارانی ئامادەیی کوردستانی کوڕان لە هەولێر، بەناوی چوارچرا، ژمارە: ١، ساڵی/ ١٩٧٢/ ١٩٧٣.

(٤) د. عیززەدین مستەفا ڕەسووڵ، ئەدەبی فۆلکلوری کوردی (لێکۆڵینەوە)، بەغدا/ ١٩٧٠، لاپەڕە: ١٠

(٥) عومەر ئیبراهیم عەزیز، گۆڤاری ئۆتۆنومی، ژمارە (٤) ساڵی حەوتەم، ١٩٨٤، فۆلکلۆری نەرێتی کۆمەلاّیەتی کوردەواری، لاپەڕە: ٩٤

(٦) عومەر ئیبراهیم عەزیز، دەستنوسێك بە ناوونیشانی «هەندێ داب و نەریتی باوی کوردەواری، لە ساڵی (١٩٨٦)»وە دراوە بە دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی بۆ چاپ کردن، رەزامەندیشی بۆ وەرگیراوە، پێشەکی ئەم پەرتووکەیە.

(٧) هەمان سەرچاوەی پێشوو، دوابەشی پێشەکی‌یەکەی.

(٨) محەمەد حمە صالح تۆفیق، گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژمارە (١٠٣ ـ ١٠٤) ساڵی/ ١٩٨٤، مەلۆیەك لە خەرمانی گۆرانی‌یە میللی‌یەکانی شایی و زەماوەندی ناوچەکانی گەرمیان و قەرەداخ و شارەزوور، لاپەڕە: ٢٧٥



# دەستنووسی شیعرێکی شێخی باڵەکان

## کەلامی شێخی باڵەکان[1]

● فائیزی مەلا بەکر ●

١ ـ دەستەی حوری و پەریان جار بە جار و ڕۆژ بە ڕۆژ دێنە خوار[2] عەرعەرن ، بازی کەرن ، ڕقاس و مەستن چاو خومار

٢ ـ دەنگی حەیران و بەلوورە، قام و چەپلەو سووسکەی دێننە جوولانێ[3] کەفەل (قل کیف ما تحت الازرار)

٣ ـ نزمی قالچەی ، توزی نالچەی[4] ، بای کراسی گوڵ گوڵی سا وەرە مەمرەو بمینە[5] ، دڵ نەچی بێ ئیختیار

٤ ـ چاوی خوم لێ مۆر مەکە مونك خودا هەڵناگرێ[6] نەفسی کافر غالبە ڕوژم دەبێتە لەیلی تار

٥ ـ جەزبی ئەم نەوعە طەریقە بێ شکە تەئثیر دەکا بوێ تەقوا بار دەکا زەرگەم دەبێتە کورەمار

٦ ـ دیڵ و گوڵ یەك مەجمەعەو سەرمەستی‌یەو بێ باکی‌یە ئەم موساواتە یەقینە لەم طەریقە دێتە خوار

٧ ـ ( فانی ) توش وازبێنە لە حالی ئەم زەمان[7] کە تەقوای تێدا نەبێ دونیایە ( جنات الحمار )

■ پەراوێزەکانی سەر دەقی شیعرەکە :- ■

١ ـ لە دەستنووسەکەدا نووسراوە ( . . . بلاکان ) . دیارە هەڵەیەو ، نووسەرەوەکەیش هەڵەی لەم جورەی زورن .

٢ ـ وەك دیارە لەم نیوە بەیتەدا هەست بە لەنگی دەکرێ . لەوانەیە هەر بو چارکردنی ئەم لەنگی‌یە بێ کە نووسەری دەستنووسەکە لە شوێنێکی تر

دوو بەیتی یەکەم و دووەمی نووسیوەتەوە ، نیوەی یەکەمی بەیتی یەکەمی بەم جورە نووسیوە : «دەستەی حوری و پەریان (جر بجر)و . دیارە ئەمەیش هەر ( جار بە جار )ە کەیەو ، بو کەمێ ڕێکی کێشی بەیتەکە کراوە بە (جەر بە جەر ! ) .

٣ ـ لە دەستنووسەکەدا ئەم وشەیە بەم جورە سەر و ژێری بو کراوە (جلان) ، کە دەکرێ بە (جوولانێ)و هەروا بە (جولـلانێ)یش بخوێنرێتەوە . بو خوێندنەوەی دووەم پێویستمان بە (شەددە)یێك لەسەر (ل)ەکەوە هەیە . ڕێی تێ دەچێ نووسەرەوە (نساخ) لە بیری چووبێ .

٤ ـ لە دەستنووسەکەدا ( نەلچەی ) نووسراوە . من بە لامەوە هەڵە بوو کردم بە (نالچەی)

٥ ـ ئەم وشەیش لە دەستنووسەکەدا (بیمینە) نووسراوە .

٦ ـ ئەمەیش لە دەستنووسەکەدا (هەڵنەگری)بوو من کردم بە (هەڵناگری)

٧ ـ لەم لەتە بەیتەیش دا لەنگی هەیە . لە دەستنووسەکەدا بەم جورە نووسراوە (فانی توش واز بینە لحال ام زمان ) .

لە بارەی نوسخەی ئەصلی شیعرەکەوە :

دەقی ئەم شیعرەم لە کتێبێکی دەستنووس ناسراو بە (سەعدینی) ، کە لە



(صەرفی) عەرەبی یەوە دەدوێ ، وەرگـرتووە . کتێبەکە سەر لە بەری بە دەستی ( صالحی کوڕی مەلا عومەری گراوی ) لە مانگی ڕەجەبی ساڵی ١٣٣٢ی کۆچی بەرانبـەر بە ١٩١٤ی زاینی لە گونـدی تەرجانی ناوچەی

گوێـر کە ئەوکاتـە لەوێ لای مەلا حەسـەنی کونـە گورگی خوێنـدوویە نووسـراوەتـەوە . شیعـرەکـە لەگـەڵ چەنـد شیعـرێکی تری صەبری‌و نەزهـەت و وەفایی‌و وەحشی‌و عونصوری‌و کوردی لە قەراخی سـەرووی

لاپەرەکانی کتێبەکەو ، لە هەر لاپەرەی بەیتێك ، نووسراونەتەوە . لەبەر ئەوەی شیعـرەکـان بە مەرەکـەبی سوور نووسـرابـوونـەوەو بە هۆی شێ هەڵکێشـان و تەربـوون ڕەنگی مەرەکـەبـەکـەیان دابـۆوە لە ئیستینساخ

کردنیـان سوود وەرنـەدەگیـرا . تەنیـا بۆ نیشـانـدانی شێوەی خەتی نووسـەرەوەکـە وام بە باش زانی دێـرە شیعـرێکی ئیستینساخ کراوی (وەفایی) تان بۆ بنێرم .

دەستووسەکە بە مڵکایەتی هی مەلا عومەری کانی ڕەشی یە کە ئێستا

مەلای مزگەوتی ( مەلا عابیدە ) لە گەرەکی تەعجیل و ، من بە هۆی کاك مەلا عەلی کانی بی دەستم پێی ڕاگەیشت .

چی لە بارەی (شێخی باڵەکان)ەوە نووسراوە :-

دوای گەڕان و پرسیار کردنێکی زۆر تەنیا ئەوەم چنگ کەوت کە زبیر بلال اسمـاعیـل لە گۆڤـاری کۆڕی زانیاری کورد ، بەرگی (٥) ، ساڵی ١٩٧٧ ، ل ٤٥١ ، نووسیویـە : « ١- فرق بالـك ١- ملا شرفی : وهی فرقـة الـرؤسـاء وتنسب الی ملا شرف ، وکان خلیفة الشیخ محمد بالك صاحب الطـریقةالسهروردیة ، وکانت منتشرة في تلك الأنحاء فتغلبت

علیها الطریقة النقشبندیة » . لە لاپەرە (٤٦٩) یش نووسیویە : «ویقول البعض وفي رأیهم منطق ووجـاهـة : (أن القبر الموجود في حاج عمران والذي یسمی بشیخ بالك یعود الی شیخ عاش قبل حوالي قرنین او ثلاثة

قرون » .

لە بارەی سەردەمی ژیـانی شێخی باڵـەکـان لە (حـاجی شێخ ئەحمەد ئاغای دیلێزی)و زۆر کەس تری خەڵکی ناوچەکە بیستوومە کە ( شێخی

باڵەکان ) لە سەدەی نۆهەمی کۆچی ژیاوە . بەڵگە ڕاستی ئەم قسـەیەیش ئەوەیە کە قورئانێك لە سەردەمی (شێخی باڵەکان) و بۆ خودی ئەو لە لایەن نووسـەری تایبەتی خۆی (مەلا عماد الدین) نووسراوەتەوە .

وەك حاجی شێخ ئەحمـەد ئاغـا دەڵێ کە قورئـانەکە (٤٨٠) ساڵ بەر لە

ئێستـا نووسـراوەتـەوە دەبێ لە ساڵی (٩٢٨) نووسرابێتەوە . بەداخەوە ! وەك دەڵێن قورئـانـەکـە لەم دواییـانـەدا ، وەك زۆر کتێب و نووسـراوی

گرانبەهای تر بووتە خۆراکی ئاگر ! .

جا ئەگـەر ئەم شیعـرە بسەلمێندرێ و بە موڵکی شێخی باڵەکان بدرێتە قەڵـەم ئەوا بە لانی کەم دوو سـەد ساڵێـك مێـژووی نووسینی شیعـری کوردی بە زاری سۆرانی پێشتر دەخا .

# چەند وینەیێت کوردی

(١)
د گەل نفیژا بوهژنی
د فرم . . . د فرم
رەهیت عەدری رادکیشم
ئاخا زەڤیا د کەمە لیف و
ب سەر خو دا د دەم
دا ب کودی خوینا من
هەمی بنار پەین بین و
دوژمنی چەپەل . . . نەشیت
فەرقودیمن . . .
ژ ڤی ناخی جودا بکەت
ژ ڤی ناخی جودا بکەت

(٢)
دەبیا بژین
ب ساغلەمی بای هەلمژین
ب بینە گوللە
ب بینە ژڤان و
ریک زوردارا بکەینە دوزەخ
چرایت مەژی
ژییت دلی
بکەینە ئاگر
کەرب سینکی کەوی بکەت
دەستا دژ کەت
وەک چەقوکەکا تیژ
خوین و خوینان ڤی کەت



دا چو جارا . . . وان کوڤانا
ژ بیر نەکەین . . . ژ بیر نەکەین

(٣)
ئەوی ژ بومبیت برسی نەترسیت
ل بەر پیلیت ترسی نەبە زیت
هیچ دەمەکی . . .
ل گڤین و برین و پیفوتانا زوردارا . . .
ناڤەجنقیت و
مرنی . . . ب دیاری . . . نائینیت . . . !

(٤)
گەلو . . .
چو خوشی . . .
هیچ شادی نینە . . .
جوا نتربیت
ل ڤەمریان و نەمانی
د کوشا یارەکا جواندا

(٥)
هەڤال :
تو د زانی . . . د ژیانی دا
ئەڤی دەریا ب پیل و بیدەنگ
نیزیکترین دەلیڤە
د ناڤبەرا ڤین و مرنیدا
جەنگە . . . جەنگ
لیپا . . . ناشتی . . .
لیپا . . . ناشتی . . .

ڤیانەو دەنگ
ژیانەو رەنگ
گەلو . . . وەرە
ها ئەڤەنە .
کەڤرو تراش گازی دکەن : ـ
ـ : خوب جڤجڤینن . . . !
ـ : کانی بزاڤ . . . ؟!
ـ : جیهی خوپەیدا یکەن . . !
د ناڤ پاپوریت مرنی‌دا
د ریکا روناهی‌ی‌دا . . !
ـ : مرنی بکەنە تانج
ل سەر سەری ژیانا چەپەل
با بلەیزیت . . !
ـ : یکەنە گول . . !
ـ : مرنا ب نرخ . .
د ناڤ پەریزیت هیشك و سوتی‌دا
بچیتە خاری . . .
پی بلندین . . . پی مەزن ین .
ـ : ب مرنا بلند . . !
ـ : ب مرنا مەزن . . !
ـ : ئەوە شادی . . . ئەمری‌یا تەقاف .
ـ : ب مرنا بلند . . . ب ئەمانا مەزن

(٧)
زاروکەکی ب پارچەکا رەژیی
ل سەر دیواری مالا خو
د نقیسی‌و وینە چی‌دکرن
چەکدارەك هات
دەستی وی گرت و برە دەف مەربی خو
کوتی : ئەزبەنی ڤی زاروکەی
ل سەر دیواریت مالا خو
شتیت قەدەعە د نقیسین . . !
مەربی وی گوت . ـ چ د نقیسی . . ؟
کوتی : تیپا واوی . . !
ـ : چ پی دیکە ژی . . ؟
ـ : وینا چیا . . !



ـ : چ پی دیکەش . . ؟
ـ : تڤەنگ و دارستان . . !
مەزنی گوتی : دەبیا زیندان بکریت
دا مەژیی وی ژ چەپەلی‌ی بشوین . . !

(٨)
ل هوازانڤانەکی پرسین .
ـ : توب چ د ژی . . ؟
هوزانڤانی گوت : ـ
ئەز د شیم بی نان و خارن بژیم
ئەو د قارم بی ئاڤ و هەوا بژیم
لی‌یا . . .
چو دەما . . . چو کاتا
بو دەمەکی کیم ژی . . ئەز نەشیم
بی ڤیان بژیم . .
سەر ئەڤی بژیم

(٩)
کەنکی هوزانڤانم . . ؟
نابیژم . . . ئەز هوزانڤانم
ئەگەر پەیڤیت من
دلی بەلەنگازا ئەڤرێ خوشی نەکەن
نابیژم . . . هوزانڤانم
ئەگەر پەیڤیت من
رەندکیت پالا کورج نەکەن .
کەنو : نابیژم من هوزان دڤین و
هەمی بەرپەریت هوزان
دێ حرکەم و دێ سوزبنم ژ
دێ کەمە روناهی ژ
ناری پی‌دەرڤەدەم و
ئالای ئاشتی‌ی ل دەڤ [illegible]
بو روژەکی ژی بیت .
ژ مالیت بەلەنگازا
ئەڤرێ خوشی‌ی ژ
پر روناهی بکەم





●نەژاد عزیز سورمی●

(١) کەلای سەوز

لە قەدی میدوزدا بوو بە بەرد

کێ توانی سەرەڕۆ نەبێت و

وەك کەلای ناوقەدی کتێبێك

بچێتە نێوقەدی مێژووەوە.

کە هاتی سەوز بووی

نەهاتبای چاتر بوو.

(٢) خەونی دی

مێشکی پەرتی سەردەم بوو

لە هەموو خەرمانی باروتی

خەونی دی

سینەی ڕووت و دادڕاوی

بەر لیزمەی تەزرە بوو

خەونی دی

مەلەی لەنێو کادا دەکرد.

(٣) ڕوویی و وتی:

به تەنكاوان نامینمەوە:

هەموو ئاشنای شەپۆلانین

هەموو ئاشنای میژووماڵی کەنەکانین . .

ڕویی و وتی‌و نەهاتەوە .

(٤) فاندوم، نە باران بوو، نە کونەکەنم

بر موزەحانەیتر دەستی نەدەدا ماموستا (کۆربێ)!

فاندوم کوتەلیٹ بوو، نەکەن نووچ دان دا ڕاقەنا.

(٥) کی تالاوی خوارد؟

کی تالاوی خخـ ؟؟

کێتـ . . ئـ . . ئـ ؟؟

کی . . ؟؟؟

ك . . تی ؟؟؟؟

ك . . . ؟؟؟؟؟

؟ .

(٦) تا لی‌ی بڕا سەمای بۆ تارماییەکان کرد . .

تا تی‌ی‌دابوو بانکی ڕاهێشت:

چۆلەکەیش بەقسە هاتن .

تا تێی دابوو . .

(٧) نەوای هێشوە بزرکاوەکان

بوو بە نووری

هێزی لە خۆرو مانگ بری

گیاو گوڵی وەجۆش هێنان

بەسەر چاك و خراپ دا باری

نەوای هێشوە بزرکاوەکان

لە تەمی ڕۆژگاردا ون بوو.

(٨) پاساری گەڵایان هەڵوەری

درەخت پەرکران .

شەوچرای ڕوژتە، پەنای چی ؟

گیانەلای ئاختە، هانای چی ؟

(٩) ئوسنابروك شارەگوندێك بوو

بەهەزاران مندالی بو شەر پی‌گەیاند

لەدوایشدا یەکێك لەو هەزارەزیلە

وتی : بو ؟

ئیستا ئوسنابروك بەو میرمنداڵە دەناسریتەوە

ئیستا ئوسنابروك لەشەرمان دەدرەوشیتەوە .

(١٠) دسان باران دایکردبوو
لە تەنتەنەی تەنیایی‌دا
نوزەی دەهات :
تو ئاسمانی
تو بەیانی
تو کونجانی نیو ڕوژگاری نەکونجانی
(١١) دوکەلکیشەکان خاموش بوون
هەوا هەناسەبر کرابوو
لەو دوورەرا چون بزانم
گوندی‌یەکان نووستوون یا بیدار؟
(١٢) شاملو
شاعیریکی ئەم جیهانی (سێیەمە!)
ڕوژی لە ڕوژان وتی :
« ئەگـەر سپـێـدارەکـەم چرۆ دەرکا، باڵندە ڕشەکە هەڵدەفری
ئەگەر باڵندە رەشەکەیش بڕوا، سپی‌دارم چرۆ دەکا . »
(١٣) فێر بووە وەختێ پڕ دەبێ
تێ‌هەڵکا ستران و لاوکان بچری
تۆئیستا دەبینی لاوك و سترانمان لە خۆمان زۆرترن .

(١٤) ئەدرەسم هێشتاکە
ئەدرەسی جارانە:
بناوانی ڕەشەبا
ئەودیوی ڕۆهەڵاتی مردن .

# وریابن

قوبادی جەلیزادە

## موو

چیمەنی هیچ
نسێو یاڵ و کەندو لەندێك .
کەروێشکەی هیچ
بیزاو قەرسیل و گیابەندێك . .
بەقەد ڕەشەمووی بن باڵی
شاژنێکی خڕو خەپان ؛
خوێنم لێ ناکەن بەنەوت و
دڵم ناکەن بە ئاگردان !!

## مەزرا

سێ ساڵ تەمەن . .
وەك سێ دەنکە گەنمی خڕپن ؛
ڕوم کردە سەر وەردی سینگم .
نە گوێم لە گمەی کۆتر بوو
نە گرمەی هەورێکی نەوێ !
فرمێسکم ڕشت . . . بۆ ئەو سێ ساڵەی تەمەنم .

تا سینگم بوو
بەسێ مەزرای گوڵەگەنم .

## خەون

کە هاوسەرەکەم کپ دەبێ

لەسەر لاشانی دەفتەرێ

بە شیعرێکی باڵدارەوە خەو دەبینێ

نەك جامخانەی زێڕینگەرێ !

## وریابن

تەزرەیەکی ڕەش دەبارێ . .
گوڵ دەکوتێ !
گوڵی سپی .

گوڵی زەرد .

گوڵی سوور .

گوڵی . . .

تەزرەیەکی ڕەش دەبارێ !!

## تەمەن

دەڵێن « شیعر » یش ، وەك « رامووسان » .
وەکوو « شەراب »

وەك « خۆشەویستی نیشتمان » ،

چرۆی تەمەن . . ، دەداتە بەر تۆفی خەزان .

ئای کورینە . .

چ شاعیرێکی کەم عەمرم

کەمن عیشقی هەر چوار ژەهرم !!

## ڕوانگە

جووتێ پڵنگ

چنگیان ناوەتە بینی یەك .

دوو ژن خۆیان دەڕننەوە . .

دوو منداڵیش

بەیێکەوە یاری دەکەن !!

## گەمارۆ

● بگەڕێوە .
- توولە ڕێکان بەفرێکی ڕەش دای پۆشیون .

● برۆ پێشێ .
- بەردەمم دیواری خوێنە .
● چاوەڕێ بە . .

- لە چاوەڕوانی گۆدۆدا . . ، گورگ دەم خوات !
● ئەی چی دەکەی ؟!
- دەگە . . ڕێمە . . وە !!
- دە . . چمە . . پێش !!
- چاوە . . ڕێ . . دە . . ك !!

## چەرم

هەناسەم فیقەی کەرەناو
ترپەی دڵم ،
دمبکی پێش چوونە شەڕە .

کەچی لەشم . .

تف لە لەشم .

ڕەشە چەرمێکی بێ فەرە !

# هەوێنی خۆشەویستی

شیعر: أحمد باوەڕ

کەلار ١٩٨٨

هۆ کچۆڵەی
تۆزێك شەرمن
بروا بکە خۆشم ئەوێی
وەکو شیعری جوان و تازەم
خۆشم ئەوێی
وەك «دیوانە» بۆ خاتوو «شەم»
خۆشم ئەوێی
وەك چۆن جووتیار
کێڵگەکانی خۆی خۆش ئەوێ
وەك چۆن بەفر
لوتکەی شاخی بەرزە باڵا
جێ ناهێڵێو
خۆشی ئەوێ
وەك چۆن گەڵا لق و پۆپی
دار بەرناداو
خۆشی ئەوێ
«وەك چۆن باران
چاوی زەوی ئەشواتەوەو
خۆشی ئەوێ»(*)

* * *

هۆ کچۆڵەی
تۆزێك شەرمن
خۆشەویستیت وەك شاگوڵێك
لە بەهاریساڵی هاتما
ڕەگ و ڕیشەی داکوتاوە
خۆشەویستیت
وەك ماڵێکی کۆچەرنشین
لەناو دڵما
لەناو خوێن و چاوی ڕونما
ڕەشماڵی خۆی لێ هەڵداوە
خۆشەویستیت
ئیلهامێکە
بۆ ئەو شیعرەی کە ئەینوسم
بۆ ئەو ژووانەی کە ئەیبەستم
خۆشەویستیت توێشەبەرەی
ڕێگای دوورە؟!
خۆشەویستیت بێ سنورە،
لەبۆ منی گردەنشین!!
لەبۆ منی تەتەری ڕێی
لوتکەی خەم و؛
کوڕگێری شین!!
خۆشەویستیت هەست و سوزە،
خۆشەویستیت ئەو ئاگرەیە
لە یادنامەی مام «کاوە»دا
بوتە هەوێن
بۆ نەوروزی خەندەو بزە،
خۆشەویستیت
ئەو گۆرانیی و ئازازەیە
خەمی دڵم ئەداتەوە
خۆشەویستیت دەریایەکە
زامی سەختی
ئەم زەمینە ئەشواتەوە...!!



* ئەم کۆپلەیە لە شیعرێکی ترمەوە وەرگیراوەو کاتی خۆی لە «هاوکاری» دا بلاوکراوەتەوە

# هوزانەك ژتورێ توركی

هوزانا: ئومێد يشار



وەرگێرانا: محسن علي شكري ژ ئەزمانێ توركى

«ئەڤ دويماهی دێ شاربن»
شويشەكا مەیێ دگەل خوبينە.
وەرە سەر گورێ من ب رينە
هندەكێ ژ وێ مەیێ تو ڤەخو
یامای ل ئاخا من ب رە شينە

** ** **

بيهنا خو بدە
دابخو دگەل ئێك باخڤين
ژ بو ئەڤينێ
دا بپەيڤين
جارەكادی
بو وارێ خو
دا هوزانا بڤەهينين و پی بێژين

** ** **

بزانە گەر ئەز مرم



نامرم مرنەكا ب خەم
ئەگەر حەژ خانمەكێ ب كەم
وەك ئاخا خو دێ حەژێكەم
سەخمەراتی تە ئەز دژيام
باش دزانم و باوەر دكەم

** ** **

وەرە لسەر گورێ من رينە
وشويشەكا مەیێ لگەل خوبينە
چنكی؟
شەرم لجەم كەسێت مری نينە
ول* روژا تو دمشەختيبی
دبت روژا ڤەژينێ

ژێدەر: ئەڤ هوزانا ژ كومەلا هوزانێت
هوزانڤانی من یا هەلبژارتی ئەوا ل ژێر
ناڤ ونيشانێت روژێك ديت تێ دەگەيت



# مۆرك

مجيد احمد عبدالله

کەقاروتیان فراند
کویرئوغلی سومایی چاوانی داهات و
کویر بوو
بەلام هیندەی نەبرد
کەچەلی بەپەند گەیاند..
کە پایز هات
شیلانە پەرەی گولی هەلوەراند
رەنگی ون کرد
هەر ئەوکاتە
تووی نوێی بو بەهاریکی تر
داچاند..
کە حەمە دوك
چقور ئاوای جیهیشت
خەلکی فیرکرد
چون عەبدی خان و چقلە شینکەی سوتاند
کە گەرایەوەش
شەهینیکی تری لە ئەناوەرزادا خولقاند
کە توش هاتی
لە پایزە وەختیکی درەنگدا
کریوەی خەمت بەسەرم دا باڕاند
کە رویشتی
بو یەکەم جار وشەی عیشقت بە گویمدا
چرپاند.
یەکەمین خوشەویستیت.
لەدلمدا رواند



# ئەڤین بەحرە

غربت فتاح



ئەڤین بەحرە بەلێ تەنها
ژ یارا دیرکەتم لەورا
تەماشا تاکەی ئەی زالم
بەناڤێ ئەڤین بەحرە

لە تاریکا شەڤا هیجرا
لە دتنێ چڤانێ یارا
من نەما صبر و ئارامەك
هەمی دەما بکوڤانم

هەڤالێ غونچێ باخانم
شەڤ ڕۆژا دنالم ئەز
شەهیدی دووری یارم ئەز
ئەڤین بەحرە

یار چرایە ژ ناڤ مالا
ب جارەك دڵ بریندارا
ژبەر ژانێ ئەڤینا دڵ
هەر ئەز پێداکەتم یارا
لە جان و ڕەوشی بەهارا
کە ئەز بێتاقەتم یارا
ب بلبلرا دلۆڤانم
ژگولێ ئەز دیرکەتم یارا
رۆندك لە چاڤ دەبارم ئەز
قەیدو زنجیری یارم ئەز




## تکایە ئەم چیرۆکە لە ئێران دا ڕوویداوە

ڕەوف حەسەن

لێرەشدا ئوتومبیلەکە هەر خێرا دەڕوات.. بەملاو ئەولادا دەڕوانیت.. دەستیشت بە زەرفەکەی باوەشتەوەیە. لەبەر سەری نەفەرەکان ئەو دەشت و دەرە باش نابینیت.. سەیرە.. ئەو هەمووە نەفەرانەو کەسیشیان ناناسیت..

باشە نیازت چی‌یە؟! بۆ دانابەزیت!؟ خۆ ڕێگاکەت هەڵە نەکردووە.. چاو بە هەر ئەو ناوچەیەشت دەگێریت ناچیتەوە سەری. ئەوا ئەو ناوچەیەشت بەجێ هێشت.. خێرا کە.. زۆر دوورکەوتیتەوە..

- کاکی شۆفێر.. دادەبەزم!

نەفەرەکان بەسەرسوڕمانەوە ئاورت لێدەدەنەوە.. سەیرت دەکەن.. ئوتومبێلەکە هێواش دەبێتەوە.. دەوەستێت.. بە شپرزەیی خەریکی دابەزینیت.. لەبەر دەرگاکەدا زەرفەکە بە دەستەوە دەدرێت و دەکەویت.. هێندەی دی شپرزە دەبیت.. ئەوە قوتووی سووراوەکەیە خل دەبێتەوە.. قەڵەمی لێوەکە بەدوویدا.. بۆیەی نینۆکەکە لەبەر پێیەکەدایە.. قەڵەمی ڕەشی چاوەکەو شانەو جانتا زەنگیانە چنەکە هەر لە زەرفە دڕاوەکەدا ماونەتەوە.. بەبێ ئەوەی سەرت بپەرژێتە سەر خواحافیزی کردن هەڵیان دەگریتەوە.. ئوتومبێلەکە جێت دێڵێت.. هەندێك لە نەفەرەکان لە جامی دواوەوە ئاورت لێدەدەنەوە.. تۆیش ئەمجا دەستی «بە خێربچن» یان بۆ بەرزدەکەیتەوە.. ئەوان سەریان لە دابەزینی ناوەختی تۆ لەم چۆڵەوانی‌یەدا سوڕماوە.. سەرەڕای ئەم هەموو کەرەسەی ئاریشتی ژنانەیەی پێتە.. تۆیش سەرت لە گۆرانی ناوچەکە سوڕماوە.

[دەشێت گوندێك بە سەرتاپای خەڵکەکەوە زەوی لووشی دابێت؟! نا.. هەر ئێستا دەچمەوە سەری.. باشە چۆن لێم تێکچوو! دەبێت لەو کاتەداو لە ئاستی گوندەکەی «نازە»دا دالْغەم لێدابێت.. گرنگ نی‌یە.. لێرەوە دەپەڕمەوە ئەو بەری شەقامەکە.. ئە ئاوا.. لێرەیشەوە بەڕاستە شەقامەکەدا دەگەڕێمەوە.. ئەوپەڕی دە دەقیقە ناخایەنێت دەگەمە سەر پردەکە.. ئەوەتا.. چۆن لێم تێکدەچێت.. ئەوە ملەی کێوەکەی پشت ئاوایی‌یە.. ئم م م.. ئالێرەوە دەڕۆم.. بەم ڕێگە قەد برەدا.. هەر ئەوەندەت زانی لەسەر گردی پشت کانی‌یەکە قوت بوومەتەوە.. نا.. نا.. ئەمە کاری کردە نی‌یە.. هەر بەجارێك ئابڕووم دەچێت.. چونکە ئێستاکە چێشتەنگاوە.. کانی ژنان جمەی دێت.. هەر دووان و سیان و چوواریان پێکەوە خەریکی کارێکن.. کوڵکردن خۆ شۆردن.. حاجەت شتن.. ئاو گرتن.. نا.. هەر بەتەنیشت ڕاستە شەقامەکەدا دەڕۆم.. خۆ بست بە بستی ئەم ناوچەیە شارەزام.. هەر گەیشتمە کن پردەکە.. لەوێوە ڕێگە پێچاوپێچەکەی دەستە ڕاستم دەگرم و.. دوور دەڕۆم و دروست دێمەوە!. ئەمەیان چاکترە.. نەك خۆم بکەمە گاڵتەچی ژن و کیژانی گوند.. هەر هەموشیان قەیناکا «نازە» نەبێت.. ئەوە هەر لێم نابڕێتەوە..]

ئەوە خۆیشت دەزانیت چی دەکەیت؟! تۆ بڕیارت دا بە ڕاستە شەقامەکەدا بڕۆیت.. کەچی ملی ڕێگە قەدبرەکەت بەرەو کانی‌یەکە گرتووە.. بۆ وا شپرزەیت!؟ تۆ مامۆستای قوتابخانەکەیان بوویت..

خەڵکی ئاوایی بە نموونەی ڕەفتار بەرزیت دادەنێن. . کەچی یەکسەر بەرەو ئەو جێیە مل دەنێیت کە شێت و هەرزەکارو مێرد منداڵە چەتوون و چەقاوەسووەکانی ئاوایی خۆیانیانی تێدا مەلاس دەدەن و. . سەیری لەشی ئافرەتانی لێوە دەکەن! ئێستا ئەگەر ئەمە ڕێی نێوان کانیو گوندەکە خۆی بووایە هەر قەیناکات. . چونکە ئەو ڕێیەیان بۆ دڵداران ئاچوغەو. . هەردەم چەتەی ماچ و ڕێگری دەروون کەیلی پەیمان و بەڵێنی خۆشەویستی لەوێدا خۆیان ناوەتەوە جێ ژووانی داهاتوویان دەستنیشان دەکەن و. . دیاری تێدا دەگۆڕنەوەو پێشکەش دەکەن. . بەڵام ئەم ڕێیە نەربێ دیاری پێشکەش کرکنی «نازە» بەو نە پەیمان و جێ ژوان دیاریکردنە. .

ئەها ئەوە خەریکە دیارییەکانت لێ بکەوێتەوە. . دەتوانیت هەندێکیان بخەیتە نێو جانتا گچکە زەنگیانە چنە دەستکردەکەی خۆت. . سووراوو شانەکە جێیان نابێتەوە. . ئەوانی دی با. . ئەئاوا. . چاکت کرد. . زنجیرەکەی دابخە. . بەس پێیدا بنۆڕە. . دیارە ئۆقرە ناگریت و لە ناوی «نازە»ی سەرجانتاکە وورد دەبیتەوە. . تەنیا ئەم جانتایە ناوی بە سەرەوەیە. . هەر ئەمەیانت بە زەنگیانەی سوور ناونووس کرد. . ئەوانی دی بەبێ ناو دروست دەکردن و دەتناردنە دەرەوە بۆ فرۆشتن.

[- ناوی نازەو یادی نازە. . چوار ساڵی ژینی ژووری تاری بۆ ڕۆشن دەکردمەوە. . چەشنی جانتاکە. . هەمووی بە زەنگیانەی ڕەش چنیومە. . تەنیا ناوی «نازە» نەبێت. . دەڵێت گرو کلپەو بڵێسەیە «نازە». . «نازەنین» ناوێکی خانەدانانەی پڕ لە ئەتەکێتی قورس و قەبەیە. . بەڵام «نازە» هەرچی ڕۆح سووکیو چرپێتیو ساکاری هەیە تێیدایەتی. . ئەیی نازە! تۆ کەی فێری ئەم ئارایشتانەیت! ئەمانە نیوەیان لە نەستەلە دروستکراون تۆ فێری حیل و مێخەك و کلتوورو خەنەیت. . نا. . تۆ هەرگیز پێویستت بە ئارایشت نەبووە. . چونکە هەردەم لەنێو ئەو باخ و کانیو دەشت و هەردانەدا دەڵێت هاکا لە کوافیری سروشت هاتوویتەتە دەرەوە. . بەڵام. . بەڵام دیاریی هەر خۆشە. . بە کاریان ناهێنیت. . یاریان پێ بکە. . ]

ڕخۆ هەر بەرێگە قەد برەکەدا دەڕۆیت. . خۆ بەخوا ڕۆژە ڕێیەك دوور بێت. . چاوە ڕەشەکانی «نازە» دەتناسنەوە. . ئەمجا سەگ بەحاڵت. . کەمێك هێدی بەرەوەو. . بزانە چی دەکەیت.

[- تازە هاتووم. . دەبێت زوو بگەمە جێ. . زوو بە دیداری شاد بم. . ئەمە چ ئەقڵێکە من لە سەرێم!! کانیو کولکردنی چی!؟ ئەمە چوار ساڵە ئاگام لە دنیا نییە. . خۆ هەموو جیهان لە پێشکەوتن و بەرەو شارستانیتی چوندایە. . ئەی چۆنە ئێستا کانی هەر بۆ جوانیو سەیران و حەوانەوە بێت! کێ دەڵێت ئێستا هەر ماڵێکی ئاوایی گەرماوێکی گچکەی بۆ خۆی دروست نەکردووەو. . هەموشیان ئاوی خاوێنکراویان بەبۆری بۆ هاتووە!! لەوانەیە کارەبایشیان گەیشتبێتێ. . ئیتر هەر گەیشتمە ئەوێ. . «نازە» پسوولەی کارەباکەیانم بۆ دێنێت و دەکاتە ڕۆژی خۆی. .

- ئەها مامۆستا. . توخوا ئەمە ڕەوایە!؟ تەنیا دوو گڵۆپ و تەلەفزیۆنێك و پانکەیێکمان هەیە. . کەچی حەوت دیناریان بۆ نووسیوین. .

- نازە گیان! تۆ سەیری پێوەرەکە بکە. . ئەی دوو ساڵ من چیم فێرکردن! نازانیت ژمارەی ئنگلیزی بخوێنیتەوە!

- ئەوە چی دەڵێیت مامۆستا نازاد! هەرچی مارکەو نیشان و ناوی کۆمپانیاکانیشە هەموویان دەخوێنمەوە. . ]

ئەوە گەیشتیتە سەر بەرزاییەکە. . زۆر نزیکیت. پیاوی چاك بەو بەم نشێوییەدا بابدەرەوە. . بەرەو شەقامەکە. . لەوێوە بۆلای پردەکە. . ئەمجا بە ڕێگە پانە پێچاوپێچەکەدا بەرەو ئاوایی. . هەر لە دوورەوە دەرکەوتیت. . نازەو دایکیو خەڵکی ئاوایی هەموو بەپیرتەوە دێن. . وا دەزانن لە ئاسمان کەوتوویتەتە خوارێ. . نا. . گومان مەکە. . خەیاڵ مەکە. .

[- تۆ بڵێیت «نازە» هەرلا نازەکەی جاران بێت؟! لەوانەیە لەم چوار ساڵەدا ئاستی خوێندەواری گەیشتبێتە ئاستی من. . لەوانەیە لە ناوەندی شارۆچکەکە خوێندبێتی. . بێگومان وایە. . ئەی تۆ بڵێیت لەم ماوەیەدا دڵخوازێکی کەی بۆ خۆی نەگرتبێت و نەیکردبێتە هاوسەری خۆی!! ئەی ئەو هەموو ئامۆزاو پوورزاو خاڵۆزایانەی لە ڕەزو بیستان و مەرەزەکانی ئەماندا کاردەکەن چین؟ ئەی دوو خوشکی دی نازەیان مارەنەکرد؟! هەموو شتێك دەشێت و دەبێت. . تەنیا ئەمەیان نا. . بروا ناکەم نازە هێند پەیمان شکێن بێت. . چونکە چاك دەزانێت تەنیا دڵێك هەیە بەو جۆرە گیرۆدەی ئەو دڵ و ڕوخسارو ڕەفتارەی «نازە» بێت. . ئەویش دڵی منەو بەس. . گەر هەموو دڵ و گیانی جیهان کۆبێنەوە ناتوانن بگەنە من. . ئیدی با سەری خۆیان نەیەشێنن و. . هەر دڵە بابچێتە ویزەی دڵێکی دیو لە نازە گەرێن. . ]

ئەکەیت بەو دیودا بنواریت. . ئەوە چی دەکەیت؟! هێندە شپرزە بوویت ئاگات لە دنیا نەماوە. . ئەی چی؟! ڕێت هەڵە کردوتەوە؟! نا. . چۆن تۆ ڕێ هەڵە دەکەیت گەر چاویشت ببەستنەوە. . گەر لێلایی چاوانیشت دابێت. . هەر بە مەزەندەی هۆش ئەم ئاوایییە دەدۆزیتەوە. . دەکەواتە جوان بنۆڕە. . بە هەموو لایێکدا بنۆڕە. . ئەوە ملەی کێوەکەی پشت ئاوایی نییە؟!

[ - با. . ]

ئەی ئەمەی لای ڕاستەوە باخەکە نییە؟!

[ - با. . بەڵام. . . ]

ئەی ئەوەی بەرامبەرت لە دوورەوە دیارە گۆڕستانەکە نییە؟

[ - با. . ]

ئەی ئەوەی لای چەپتەوەو لە دوورەوە، لەسەر شەقامەکە. . [ - با. . ئەویش پردەکەیە. . ]

ئەی ئەمــەی لای خوارەوە کانی‌یــەکــە نی‌یــە!! ئەو ئافـرەتـانـە نابینیت لەوێـوە.. لە خوارەوە پەنجـەت بۆ رادەکێشن و قریـوەیـانە؟! ئەی ئەوە نازە نی‌یـە لە نێـوەنـدیـانـدا دەتـریقێـتـەوەو هەموو ددانەکانی بە دەرەوەن و بەگاڵتە پێکردنەوە هاوارت لێدەکات.

«- هۆ مامۆستا ئازاد! کەی هێندە بێچاوو روو و شـەرم و شکۆ بوویت؟! ماڵ خراپت نەکـەن چاو بنـووقێـنـە.. ئەو ئافـرەتـانە هەموو رووتن.. کورە نامەردت نەکەن بەرکە بەولاوە..»

گوێت لێیەتی؟! دەبیینیت؟!

بە هەموو هێزت هاوارت کرد

- نا..

«نا» بە هەموو لایێکدا دەنگە دەداتەوە.. هێدی بەرەوە.. بە هێمنی پێیاندا بچــۆرەوە.. جاری تۆ وەرە خوارەوە.. بزانــە ئەو گونـدەی تۆ بە دوویـدا وێڵیت خۆیەتی یان نا!! چونکە گوندەکانی ئەم نیشتمانە زۆر لەیێك دەچن.

وەرە خوارەوە.. هەمووی چەند هەنگاوێکە.. ئە ئاوا. خۆت بگەیەنە سەر پردەکە.. خێراکە.. جانتا زەنگیانە چنەکەت توند بگرە.. ئەوەتا.. گەیشتیتە سەر پردەکە.. ئەمجا بەلای راستدا.. رامەکە.. جوان برۆ.. خۆت قیـت بکــەرەوە. سەنگیـن و گران.. هەر لە دوورەوە هەمــوو بە پێشوازیتەوە دێن.. ئەها ئەوە نازەو دایکێتی.. چۆن وا زوو پێیان زانی! ئەوەتـا نازە لە دوورەوە بەرەو رووت دێـت.. رادەکـات.. باوەشـی بۆ گرتـوویتـەوە.. هاتنـەوەت هیچ شەرم و شکۆیێکی لا نەهێشتـوەوە.. تۆیش بەرەورووی برۆیـت.. وادەزانــن فلیـم دەردەکــەن. تادێـت ماوەی نێـوانـتـان... دووروودرێـژتـر دەبێـتـەوە.. دەتانەوێت لەبەر چاوی هەموو خەڵکی یێکدی لە ئامێز بگرن و تێرتێر یێکدی ماچ بکەن.. دایکی نازەش لە خۆشیـانـدا نازانێت چی بکـات.. نازانێت کەفـارەت بوونی بەربـوونت لێبکات یان پیرۆزبایی زەماوەندی «نازە».. دە خێراکە.. خێراتر هەرچی هێزو تینت. تێدایە بێدەرە لاقەکانت..

ئەوە هەڵکــەوتیت! بەدەمــدا کەوتیت! هیــچ نی‌یــە.. ئەوە داروپــەردووی خانووەکانی ئاوایی‌یە.. جانتا خنجیلانەو دیاری‌یەکانت لەدەست پەڕین؟! قەینـاکـا.. خۆ ئازارت پێ‌نـەگـەیشت.. ئانیشـك و سەرئەژنۆکانت کەمێك رووشاون.. هیچ نی‌یە کەمێك پشوو بدەو بنۆڕە داروپەردوو.. سەرتاپا داروپەردوو..

ئەمجـا هەسـتـە.. بەرێی گۆرستـانـەکـەدا برۆ.. بەسـەر داروپــەردوودا برۆ.. تازە خۆ تۆ هاتــوویت.. نەوەك بە هەڵـەدا چوو بیت.. ئەئـاوا.. لەوێوە بەرەو گۆرستانەکە.. برۆ.. برۆ ئەوەتا هەندێك کێل دیارن.. هەر برۆ.. بەو دیویدا بەرەو نزیکی ملەی کێوەکە.. لەوێوە بە تووڵە رێیەکەدا بەرەو داروپــەردوو بگــەڕێـرەوە.. ئەمــەیان رێی گەرانــەوەی ران و رەشـە وولاخ و سەگـەکـانی نێـوارانە.. وەرەوە.. ئاوا.. ماندووبوویت؟! گیانت سەر ئارەقە نیشتووە؟! هەر دەگەرێیتەوە ئێرە..

دە لەم لایشەوە.. لەرێی باخەکەوە برۆ برۆ.. ئەو ناوە سازگارە.. برۆ حەزت لە چی‌یــە بیخــۆ.. ترێ.. هەنجیـر.. قەیسی.. قۆخ.. ها.. هیچی لێ‌نی‌یە؟! دەکەواتە بەو دیویدا بەرەو کانی‌یەکە برۆ.. ئەمجا بەرێی چەتەی ماچ و دەروون کەیلاندا بگەرێرەوە..

جارێکی دی بەپێچــەوانــە.. بەرێگــە پێچـاوپێچـە بەرینـەکـەدا بەرەو پردەکــە.. پێـدا پێـدا برۆرەوە.. خێــراکــە.. لەولای شەقـامـەکـەوە بۆ گۆرستانەکە.. لەوێشەوە بۆ نێو دارو پەردوو.. ئەمجا بە تووڵە رێیەکەدا بەرەو ملەکە.. لەو دیوەوە بۆ باخەکە لەوێشەوە بەرەو داروپەردوو.. هەتا هەنــاوت تێـدایــە پێیــانــدا برۆو وەرەوە.. برۆو وەرەوە بزانــە لە کوێ دەیدۆزیتەوە.. هەناسـەت سوار بوو.. هەناوت لەبەر برا.. لێوت وشك بەبار پشوو بدە. لەنێو دارو پەردوودا پشوو بدە.. ئازاری ئەژنۆو ئانیشـکت لەیـاد نەمـاوە.. بە هێمنی بۆن بەو دارو پەردووانـەوە بکـە. هە موویـان بۆنی کچێنی‌و خۆشـەویـستی «نـازە» یان لێ‌دێت.. ئەمجـا چی دەکـەیت؟! نیازت وایە هەتاهەتایە لێرەدا بمێنیتەوە؟

[ - نا.. ئیتر چاوم بەرایی نایەت بەم دارو پەردووانەدا هەڵبنۆرم.. ]

هەستایت؟! چاکە.. بەرەودوا.. پشتاوپشت دەگەرێیتەوە؟! هەرچاکە.. وەك لە دیدەنی مەزارێکی پیرۆزدا بیت وایتە.. ئەی دیاری‌یەکانت؟ ئەها ئەوەتان بە نێو دارو پەردۆکاندا پەرش وبلاو بوونەتەوە.. نیازت نی‌یە کۆیان بکەیتەوە؟!

[ - نا.. با ئەمانە هەر لێرە بن.. وەك یادگار لێرە جێیان دێڵم.. دەرۆم.. بەرەوکــانی‌یــەکــە.. گەرچی ئەویش کاولـە بەڵام هێشتـا ئاوەکـەی روون و جوانە.. بەتەواوی کوێر نەبوتەوە. جارێکی دی تینوێتیمی لێ دەشکێنم.. ئەمجـا بەنێچگـاری دەرۆم.. دەکـەومە سۆراخی «نازە».. لە هەر کوێیێك بێت هەر دەیدۆزمەوە.. ]

کەواتە دوێش دامەمێنە بنۆرە ئەها ناوی «نازە» بە زەنگیانە سوورەکانەوە لەسـەر جانتا زەنگیانەچنە رەشەکەوە لەنێودارو پەردووکانەوە دەدرەوشێتەوە..



# باڵندەكان بەرزدەفڕن

● عبدالله سراج ●

## ١ - ناخ

سەگێكی گەڕ بەلاتەكی سۆفی‌یەكدا تێپەڕی، نەخۆی لێ‌لاداو نەدڵیشی لێ‌كرمێ بوو. دەمێك پرسیارێكی ئاراستە كرد.

- تۆ پیاوی پاكژی یەزدانیت، چۆن لەو سەگە گلاوە سڵت نەكردەوە!.

سۆفی‌یەكە بە هێمنی‌و ساركاری دوا: ئەو سەگە لە دەرەوەیدا گلاوو

پیس دیارە، وەلێ. لە ناوەوەیدا وای نابینم چونكە ئەوی دیاردەیەكی دەرەوەی بوو بێگومان لە دیوی ناوەوەیدا شاردراوەیەكی هەیە.

كابرای دەم بە پرسیار زاری داچەقاند بوو. سۆفی لەسەر قسەی خۆی ڕۆیشت.

- ... چۆن خۆم لەو سەگە هەڵاوێرم! ئەوەی لە ناخی مندایە دەق وەكو دەرەوەی سەگەكەیە، ئیتر لەپای چی خۆمی لێ‌لادەم لە كاتێكدا ناتوانم لەم ناخەی خۆم دووركەومەوە.

كابراكە حەپەسابوو. هەڵیكوتایە سەر دیوارێكی ڕووخاوو جاڕی دا.

- خەڵكینە، هاوارە، مامە سۆفی تێكچووەو بە زمانی ئەوانگەل و جنۆكان دەدوێ.

●

سۆفیش زاری هەڵهێنا: هەی دەم بڵاوی زگ ڕەش. لاكەوە هەی كەتن گیر، تۆ ڕۆحت بریندارەو منیش دەمەوێ دەمی چەقۆ بم؛ تیژوڕاست. دەمەوێ ئاونگ بم؛ پاك و بێ‌گەرد.

مامە سۆفی سەری خۆی هەڵگرت و ئیتر وەك منداڵێك پارەیەكی

سپاردەی دایکی گوم کردبێ، بیرای‌بیرای نەگەڕایەوە ئەو گوزەرە.

***

## ٢ ـ گەرد

هەژارێک بە گەشکەداریەوە هەنگاوی دەنا. دەستی لەسەر خەلاتەکەی شا دانابوو کە دابوویێ لە بری چەند ساڵی ئەمەک داری و دڵسۆزی. گەردی ڕێگا خۆڵە پەتانەکە نیشتە ڕوخساریەوە. دەستی بۆ چمکی خەلاتەکە بردو تەوێڵی خۆی پێ سڕیەوە. تومەز چاو هەبوون چاودێری ورد و درشتیان دەکرد، یەکێك لە گزیران لە دەرباری پاشادا گوتی:

ـ ئەی سوڵتانی کات و جێ و پەرندەو گازندەو گیاندار و بێ گیان، دەزانی ئەو هەتیوە گەردو خۆڵی ڕێگای بەخەلاتەکەت سڕیوەتەوە! قوربان چ تاوانێك لەوە گەورەتر هەیە! دەبێ سزای چی بێت!!

بەزەیی لە دڵی شادا تاراو شێتگیر بوو. ئەو کردەوەیەی بە سەرپێچی زانی لە فەرمانی زەوی و ئاسمان، بۆیە دەسبەجێ ئەو بەسەزمانە کرایە ملوانکەو بە سێدارەکەی بەر دەرکی دەربارداو ئاوێزان کرا.

***

## ٣ ـ خۆ دۆزینەوە

شاگرد لە مامۆستای نزیك بۆوە: ئەی هیپوکراتسی مەزن، تۆوایت لە دوا هەناسەدا، پێم بڵێ چۆن پاکژت بکەم و لەکوێ بتشارمەوە؟

هیپوکراتسی حەکیم چاوی کردەوەو لە سەرخۆ داخاوت:

ـ ئەگەر نیازت وایە جارێکی دیکە بمدۆزیتەوە، ئەوا لەو جێگایە بمنێژە کە خۆت دەتەوێ. وەلێ، ڕۆڵەکەم.. منێك کە تەمەنی دوورو درێژم بەسەر بردو هەرگیز خۆم نەدۆزیەوە، چ جای تۆ کە لەپاش مەرگم چۆن دەمدۆزیتەوە!؟ من کە کۆچی دوایم کرد، ئەوە کاتی نەمانە، ئەوساش تاڵە موویەکی سەرم هەواڵم نازانێت.

کەمێك بێدەنگ بوو هەتا بزانێت کاری وتەکانی چۆن دەکەوێتەوە، ئەمجا گزارەی کێشا ـ: تۆ بڕوانە خۆت، هابیل وقابیل هەمیشە لە ناختدا زیندوون، ئیتر چۆن شەڕ نابێتە جمکانەی مرۆ! هەتا قابیل هابیل مابن، تەلاری ورك هەڵدەکشێ و... زنجی دەمی برسیش دادەنەوێ. ئەو قۆچ لە داوێنی هەور دەژەنێ. ئەمیش خاك وخۆڵ ڕادەموسێ.

***

## ٤ ـ سووتان

گەورە پیاوێك لە سۆفیەیەك چووە پێش و بەچپە دو گوتی:

ـ برا.. چۆن ڕۆژگار دەگوزەرێنی؟

گوتی: لە توونی گەرماوێك دام، بە دڵەڕاوکێ و لێو بەبارەوە، وەلێ پەلم بۆ کولێرەیەك درێژنەکرد بۆئەوەی ملم لە شمشێر بپارێزم.

گەورە پیاوەکە وەرامی دایەوە: دەزانی بەدزی تاوانبار کراویت!؟

ـ دزیی چی! من بێ خەوشم وەکو ناو لەپی دەستم.

ـ دزینی هیس و دووکەڵی توونی گەرماوەکە. بەڵگەشیان هەیە، ئەوەتا خەرقەکەت شایەتی دەدات.

ناخی سۆفیەکە بووە گرکان و تەقیەوە.

ـ وەی چش. یەکسانە لام ڕووت بم یان پۆشتە. ئەم خەرقەیە دەسووتێنم.

گەورە پیاوەکە گوتیەوە: نەکەی، ئەوساکە تاوانی گەورەترت دەخرێتە

ئەستۆ.

سۆفی برەوی بە داخــاوتنــەکـەیدا: هەرچی دەبێ بابێ. کە من لە قەفەزی لەشم دابڕرام ئیدی باکم لەچی بێت. با بڵێـەی ئاگریان بەگڕما بچێت. من خۆم هەم ئاگردانم و هەم پشکۆم، وا پەیتاپەیتا. ئاورینگم لێدەبێتەوە.

***

## ٥ ـ نرخ

هەنــد سیخنــاخ و هەرمێن بوو، سەگ خاوەنی خۆی نانـاسیـەوە. هەریـەکـە دەیـویـست لەو تێکچـڕژانـەدا، دیـدەی خۆی بە ڕوخسـاری یوسف شاد بکــات و دەروونی بە. جوانیـیەکـەی دامـرکێنێ. لەسـەر سەکـۆیـەکـەوە بانگاواز درا «ئەوەی دراوو زێری پتر بدات یوسف بۆ ئەو دەبێت ـ وەرنە پێشەوە ـ ئەها باڵای ڕاستە وەك دارخورما ـ پێستی سپی‌یە وەك چوری. شیر ـ چاوی کەسکە وەکو گەڵای کاهو ـ دەستی نەرموڵەیە وەکو کلکی ڕێوی ـ دەی نزیك بنەوە..»

لەنــاو ژاوەژاوەکــەوە، دەنگی ڕەزامــەنــدیو ناقــایلیو تووڕەیی‌و سەرسامي تێك دەئاڵان. هەر کەللەو ئاوازێك بوو.

«چۆن پێغەمبەری خوا دەفرۆشرێت! ـ بە هەزار پارچەی زێر لەسەر من ـ ئاخـر زەمـانـەو کزە لە جەرگ دێنێ ـ ئەگەر پێغەمبەرە با پەرجوویەك بنوێنێ ـ دەمی بکەرەوە با دگانەکانی بدینین ـ ئای لەم نارەوایی‌یە! ـ دوو هەزار زێری تەواو ـ چوار هەزار ـ لەسەر من بە دەهەزاری زرنگەدار.»

کریـاران لە زۆری دا بوون تەنـانـەت لە ئاکـامـدا نرخی گەیشتـە دە هەنـدەی کێشی خۆی ـ لەم کاتـەدا پیـرەژنێکی بێ‌پـرزەی ئارام هەڵگیراو درنی بە خەلکـەکـە داو بە تالووکەوە خۆی کوتایە ناوەندی هەرمێنەکەوە. دەمی نایە دەلاڵە کەنعانی‌یەکە:

«دەبێ بۆمن بێت، چونکـە لە تاسـەی ئەم یوسفـەدا ئۆقـرەم نەماوە، گلاراوم، سەبـری ئەیـووبم سواوە. هانێ ئەوا دە گوریسم بەم دەستـە لەرزۆکانەی خۆم ڕیستوە؛ دەیدەم لە نرخی یوسفی نازدار دا. ها لێمی‌وەرگرە.»

تریقـانـەوەی تەوس و پێکەنین وای لە هەندێك کرد بەپشتا بشکێنەوەو برێکی دیکـەش دەست بە ورگیـانـەوە بگـرن نەبـادا ڕیخـۆڵەکانیان بێتە خوارەوە. ئەمجا دەلاڵەکە بەتیزەوە بە پیرەژنەکەی گوت:

ـ ئەوی دەیفـرۆشـم گەوهـەری بێ‌هـاوتایە هەی خرەفاوی پرچ خوری. ئەوە وڕێنـەی چی دەکـەیت! بۆلە تۆوایـە بازاری تۆڵـەکـە فرۆتنە!! ئەم یوسفە چەردەو بەهای سەدان کەنجینەی ئەم حەمکە ڕاوستاوانە دێنێ: تۆ کێیت و ئەم گوریسانەت چین!؟

پیـرەژنـەکە هاتەگۆ: دڵنیام لەوەی کەسێك هەندەی من نرخی نەداوە. هەر چۆنێــك بێت من شانــازی بەوە دەکــەم کە دۆست و دوژمن بڵێن پیرەژنێك یەکێك بووە لە کریارانی یوسف. ئەم گوریسانەی من لە زێری تێزایی ئەوان کەڵکدارتر و سوود بەخشـترە. دەبزانم دەی دەتوانن بە پارەو خشـڵ و زێـریـان جل هەڵخەن.. ئاو هەڵبگۆزن.. بار شەتەك دەن.. خۆیـان بخنکێنن!! هەمـدیسـان قاقـای پێکـەنین دەنگی پیـرەژنـەکـەی هەڵمژی.

***

## ٦ ـ ئاو

خلەسـەقـا لەناو بازاری شاردا بە ڕاویە ئاوی دەفرۆشت. لەولاوەش بلە کونـدە ئاوێکی بە کوڵـەوە بوو هێدی‌هێدی ئاوی دەبەشاندەوە. خولە پێشـوازیی لێ‌کـردوو داوای جامـولکەیەکی ئاوی لێ‌کرد. بلە بەگەمژەی داناو گوتی:

ـ خۆت سەقایت، بۆ ئاوی خۆت نۆش ناکەیت! هەی نەزان.

خلە بەدڵێکی حەسرەتناکەوە هاتە وەڵام:

ـ هەی زانــا، وریـا بەو جامێکی تژیم بدەری چونکـە دڵم لە ئاوی خۆم تۆراوە. بلە سەرێکی باداو جامێ ئاوی لێـواولێـوی لە کونـدەکـەیـە بۆ تێ‌کرد. ئەویش بینی پێوە ناو پاشان بە (ئوخەی) سوپاسگوزاریی خۆی دەربـری. ئەمجـا بە زەردەخـەنـدیـەك لە هاواڵـەکەی جیابووە. دەنگی بەئاسپایی هات.

ـ هەی پشـوو تەنـگ، نەتـزانیـوە ئاو هەیـەو ئاویش هەیە. کوندەو ڕاویە هاوتای فریشتەو هەریشتەن. هەی نێرەسووکی مێشك کادێن.

***

## ٧ ـ خۆشەویستی

ئاییز پەروەرە لە خوا. ترســەکــە لەخــەونیــدا فاسقێکی دی وا لە گوڵشـەنێکی شکۆداری بەهەشت دایە. دەوەنە جارێکی دلارا لەباوەشی گرتووە. بۆیە برۆی سەرسامی‌ی هەڵبری‌و دەمی حەپەسانی لێنا

ـ ڕوخســارت وەکـو ڕۆژ دەدرەوشێتـەوە! پێم بڵێ چۆن بوویتە خاوەندی ئەم پایـەو مەقـامـە؟ تۆ ئەوەنـدە چەشـەی ژیان بوویت، لە سەرتەوە هەتا کەلەموستی پێت نوقمی گوناهو تاوان و سەرکێشی بوویت!

ئەویش بە دڵنیاییەوە وەڵامی دایەوە:

ـ لە بیرتە کە تەرمەکەی منیان فڕێدایە لاڕێیەکەوە، تۆ وەك ئەوەی گلاوبم

خوت لاگرت، نەبادا ناچار بیت نوێژی مردووانم بۆ دابەستیت!

- هەی بالا گەردانت بم. بەڵێ وابوو.

- سەبارەت بە سەنگە دڵی تۆ، خودای دلۆڤان پاداشتی دام و لەسەر تۆبەی گوناهەکانم بورد. جا بنۆرە ئەو حیکمەتەی کە لە خۆشەویستی‌یەوە هەڵدەقوڵێ.

دیندارەکە دایە پرمەی گریان و وەکو پەرکەم دارێکیش لە خەو بێدار بۆوە. هەمدیسان بەکوڵ رۆندکی هاتە خوار وهەتازیاش کەیلی خەم بوو لەمەر ئەو نسکۆیەی‌دای.

***

## ٨ - کەوڵ

گوتم: کارا، ئەم شەو حەکایەتی دوو رێویت بۆ دەگێرمەوە. دوو رێوی‌یەکە هاوسەری یەکدی بوون لەو بیروونە. وراقەدا. پاشایەکیش مەراقی شکاری نیشتە سەر و پلنگ و شاهۆی بردو لەو بیابانەدا تەنەی خۆی نایەوە. هاکا جووتە رێوی بوون بە تەڵەزگەکەوە.

کارا پرسیارێکی قوت کردەوە: ئەی کە پلنگ و شاهۆی راوی لەتەك دا بوو، بۆچی تەڵەی نایەوە؟ ها!!

ئەمنیش بونەوەی لە تۆرو تەڵەی پرسیارەکە خۆم لادەم بەپەلە هەڵمدایێ:

- ئیتر.. مام عەتار وای گێراوەتەوە.

ویستی بڵێ ئەو مام عەتارە کێ‌یە؟ من زوو سەربردەی رێوی‌یەکانم تەواوکرد.

- رێوی‌یە مێیەکە بە مێردەکەی گوت: هەی وێڵ و سەرگەردانی پەسارگەو کون و کەلەبەران، دە پێم بڵێ ئاکام دەگاتە کوێندەرێ؟! ئەویش بێ‌پەروا گوتی: ئەگەر پاشماوەیەك لە تەمەنمان مابێت ئەوا لە دوکانی کەوڵ فرۆشێکی شاردا خۆمان دەبینینەوە. ئەمجا رێوی‌یەکە گوتیەوە: بۆوامت بوویتە! بۆ هاوار ناکەیت؟ خۆ کرکردن دادمان نادات. مێردەکەی وەرامی دایەوە: ئێستاکە وا هاوار دەکەم بەلام کەس گوێی لە هاوارم نی‌یە. سەرەرای. ئەوەش هاوار بۆ کێ بەرم؟ بۆ راوکەرکە مرخی لە کەوڵمان خۆش کردووە!! کارا سەرنجی بلند کردوو سەرنجی لە کەوڵە هەڵواسراوەکەی بالا سری‌دا.

- کێ دەڵێ ئەم کەوڵە یەکێکان نی‌یە.

منیش بە دەنگی نزم گوتم: یەکێکیان نەبێ، خۆ لە هاورەگەزی ئەوانە.

***

## ٩ - مەرگ

شمشاڵ ژەن لە دوا هەناسەی مەرگدا بوو. کەسێك پرسیاری لێ‌کرد.

- تۆ ئێستاکە وایت لەناو چاوگەی نهێنی و خولگەی ئەزموونەدا، پێم بڵێ حاڵت چۆنە لەم ئاسیوو تەنگانەیەدا؟

شمشاڵ ژن هەناسەیەکی پرخەداری هەڵکێشاو وشەی ناخی خۆی دەرپەراند.

- هەرگیز پەیڤی زار ناتوانێ لە بارەی ناوەوەم بدوێت. ئەز لە سەرانسەری ژیانمدا توندو تیژ بووم وەکو رەشەباو لە ئەنجامیشدا!

رووەو خاك بوومەوە.

- ئەی مرۆڤت چۆن بینی؟

گوتی: جێی سەرسوورمان نی‌یە چۆن مرۆڤ لە دایك دەبێ‌و دەمرێ. بەڵکو لەوە دایە چۆن ئەو مرۆڤە رنووی بەفر ئاسا. هەرەس دێنێ‌و دەرمێنە. ناو گۆمی لیخن و شەوە زەنگەوە.

کەسەکە دامابوو. کە ئەو لەسەری رۆیشت.

- ئێستا تامەزرۆی هامێزی مەرگێکی خاوێنم. ئەڵبەتە لەتاو کلپەی دەروونم وا رووی پاراوم وشك هەڵدەگەرێ... دەپیشێ.

ئەمجا وەك ئەوەی لەگەڵ خۆی قسەبکات..

-... ئای مردن، وامدەزانی دژو پێچەوانەی ژیانی، خۆم لێت دەپاراست بەلام نا، تۆ تەواوکەری ژیانی. بێ‌تۆ ژیان تام وبۆی نامێنێ. تۆو ژیان بازنەیەکن. سەرەتاو کۆتای یەکدین هەر وەکو مارێك کلکی خۆی کرتبێ بۆیە ئێستاکە دەبینە هاودەمی یەکجارەکی‌و سەلماندت کە راستی‌یەکی پاکژو نەم.. نەم.. نەمر.. نە.. مە.. رێ.. ێ.. ێ ێ ێ

پێتەکان لەچەشنی دانەی تەزبیحێکی پساو لێك ترازان.

**شوباتی ١٩٨٩**

### تێبینی

١- ئیلهامی ئەم چیرۆکۆکانەم لە (منطق الطیر) (فریدالدین العطار) وەرگرتووەو تەوزیفم کردووە.

٢ - پەپوولە سلێمان رابەری باڵندەکان بوو کە دەفرین بەرەو مەڵبەندی سیمرخی مەزن. لە پشوودانی رێگادا حەکایەتی بە تۆیکڵی بۆ دەگێرانەوە بەڵکو خەمە وردەکانیان لەبیر چێت و لە فرین کۆڵ نەدەن هەتا بە ئاواتی پیرۆزیان شاد دەبن.

# لەپەنا دەوەنێکدا

احمد سید علي بەرزنجی



*ڕوداوەکانی ئەم چیرۆکە دەشێ لە هەر لایەك کە ستەم تیایدا باڵی ڕەشی بەسەر ژیاندا کێشابێ ڕوبدات، ئەو زۆرداری‌یەی لە فەلەستین و خواروی ئەفەریقا ڕودەدات چوون یەکن، بەڵام جیاوازیەکەی ئەوەیە یەکەم کەوتۆتە سەر هێڵی «٣٤»ی پانیو دووەم وا لەسەر «خولگەی کارژۆلە»* ڕووداوی ئەم چیرۆکە لە کوردستانی ئیران دا ڕووی‌داوە

ملەی دوو گرد. بە لێژی‌یەکی کەمەوە. دامێنەکانیان داکشابوونە سەر یەکترو ئاودرێکی باریك لە یەکی کردبوون. ئەم بەر دارپەڕوە پیرەکان بە چڕیو ئالوزی سەرەو ژوور بوونەوەو هەر کە شەمالێك بهاتبا نەمان هاژە هاژیان لیوە دەهات. ڕیگلیەك، سەلتە زەلامی، لەم سەرەوە لەناو دێ بو ئەوسەری باخ و ڕەزەکانی دەبڕی و ڕیبوارەکان بەیارەکانیانەوە. هەتا ئەگەر زوریش بوونایە. کە دەچوونە ئەویەوە ترسی تاریکیو کپیو شێداری دەیگرتن. تاق تاق کەرەیەك بەشەو لەو نزارە پڕەوە دەنگی دەکردە ئاواییو ئیشکی ئەو خەلکە ماندووەی دەکرت. ژن و منالی ئاودیی دەترساند؛ دەیانوت گوایە ئەوە روحیانەی ئەو تاقە قەبرەیە لەژیر دارەکانداو شەو دێتە دەری و دوعا لەوانە دەکات کە پیاو خراپن!!

ئەوبەر، ماڵەکان بە نارێك، بەلام لەسەریەك، لەگەڵ لێژی قەدپاڵەکەدا داهاتبوون و لوتیان ژەنیبووە ناو توتن و دێیەرەکانی خوارەوە.

گەلای زەردی پایز هەر ساتە تاسیتی لە چلەکەیەوە بەرەو ڕوو بە ئەسپایی دەکەوتە سەر زەوی، دلی خەلکی بەو پەلە هەورە بلاوبلاوانەی ئاسمان دەگوشرا.

زور شت لەم دێیەدا لە ناکوکیو دژایەتی‌یەکی تیژدا بوون، زوری دیش لە تەبایی‌و کوکی‌و گونجاندنیکی تەواودا بوون؛ بەلام هەردوولا قورت و تەگەرەی خویان کەنەفتی کردبوون.

جا ڕوداوەکانی ناو دێ، بە خۆشی‌و ناخۆشی‌یەوە، دەقاو دەق ڕۆمانسیەتێکی فەرەنسی‌و ڕیالیزمی‌یەکی ڕوسی بە خۆوە گرتبوو، کەچی خاسیەتی خۆی‌و ڕەسەنێتیشی دەدرەوشایەوە.

حەوت سەگ، زل و مل هوڕ، سپی‌و بۆرو بەڵەك وڕەش، تەنیا یەکێکیان قاوەیی‌یەکی کراوەی چوارپەل تامەچەك سپی‌و دێل، لە لای وەردەکەی ڕۆژاوای ئاوایی‌یەوە بەو قەدپاڵەوە خۆیان لەبەر تیشکی گەرم و گوڕی هەتاوەکە هەڵ خستبوو، هەموان بە چاو زیت و وریا بوون.

دووازدە چاوی تیژ وەك بروسکە، کرابووە دێڵەکەو هەر بجولایەتەوە شەشەکەی دیش دەجولان، وەك بە پەتێکەوە پێوەی بەسترابن، یەکێکیان هەڵ دەستاو بۆنێکی پێوە دەکردو ئەویش مرەیەکی لێوە دەهات و ئەوانی دی وەك بڵێی لە داخان وەخت بوو دڵیان دەربێ و ئاوێکی خاى ڕوون دەزایە ژێر زمانیان و لە نێو کاکیلەو کەڵبەکانیانەوە تك تك دەرژا بە لا شەویلگەیاندا و لەوێشەوە بۆ سەر زەویەکەی نێوان هەردوو دەستیان... بۆیە هەر کەة ئەو یەکە چەپۆڵەکانی دادەدایەوەو دەکەوتەوە، یەکێکی دی هەڵ دەستاو بە هەمان دەستور لوتێکی لە پاشڵی دێڵەکە هەڵ دەژەن.

مشت و مڕو قینەبەرایەتی‌و زۆرانبازی‌یەکی بێدەنگی ئێجگار بەتین لەو ناوەدا بەرپا ببوو، گەماڵێکیان کە جار جار قەپێکی دەهاویشت بەلای قەبرغەی خۆیدا، مرخەو نووزەیەکی لێ دەهات، مێشە سەگانەیەك ـ حەیشی لێ ستاندبوو، ئەمەش چووبووە سەرباری ئەو هەموو ئاڵۆزی‌یە دەرونی‌یەی کە بە هۆی ئەم دێڵەوە تووشی هاتبوو.

شەوێ هەر خۆی‌و ئەوبوون، گێرەی ناو دێ‌و بن دیوارو ناوباخەکانی پێ کرد بە بێ ئەوەی خۆ با بە دەستەوە... جا وردە وردە سەگەلی ئاوایی پێیان زانی و بۆنی (بەبایی) ئەو دێڵەیان کردوو وروژان... لە تێك بەردان و پیاهەڵ شاخیندا، لەسەر دێڵەکە، ئەوەی لە باریدا نەبوو بە کەسەرێکی زۆرەوە ملی خۆی شۆڕکردوو بۆ ئەوانی کەی بەجێ‌هێشت، ئیتر مانەوە ئەم شەشە کە وا دیارە ئامادەن لە پێناوی جوت بوونێکدا سەردانێن.

تیشکی خۆر ناوشانی گەرم دادەهێناو سەرمای شەوێکی باراناوی تەڕی لە لەش دەردەکرد؛ هێشتا حەوتی بەیانی‌بوو بەلام بۆ دێیەکی وا درەنگ بوو، هەر لە زووەوە هەر کەس چووبوو بە لای کاری خۆیەوە.

(عەلی) لەسەر سەرەلوێنکەکەی ناوەڕاستی دێ، بە چیچکانەوە دانیشتبوو، گالۆکەکەی لە نێوان هەردوو ئەژنۆیەوە بە شانی چەپی‌دا هەڵ پەساردبوو، هەروا وردە بەردی دەگرتە یەك دوو مریشکی نێزیکی کە لە خوڵەکەدا چینەیان دەکردو خوڵیان بەسەر خۆیاندا دەکرد، بەڵام بە هۆش و بیر لە لایەکی دی بوو، سەر ئەژنۆکانی لە تلیشی دەم شەرواڵەکەیەوە وەدەرکەوتبوون و، پەنجە گەورەکانی پێی وەك سەری دوو کیەڵ ملیان لە قاوغە کدیانەوە وەدەر هێنابێ، ئاوا سەرەتاتکێیان دەکرد.

قژ بژن و تۆزاوی، لولی‌یەکەی ئەوەندەی دی دیمەنە کەی سامناك کردبوو، ڕیشی وەك ریشاڵی قەوزەی جۆگایەکی کۆنی سەرەولێژ ئاوا داتەکابووە خوارێ، بەڵام جووتە چاوە ڕەشەکانی پاك و ساف دەتوت شەوەن لە بن کانی‌یەکی ڕوندا بریقەیان دەهات.

لەبەر خۆیەوە شتێکی بە ئاوازێکی خۆشەوە دەوت، جار جار دەنگی بەرز دەکردەوە، بەڵام ماناکەی نادیار بوو، بڕۆی پڕو چڕی دەهاتەوە یەك و چاوەکانی کز کردبوو، لە پڕ گەش دەبوونەوەو پەرەی لوتی دەکشاو کونە لوتەکانی فش دەکرد... ئەمانە ئازارو ئەشکەنجەیەکیان دەردەبڕی کە لەگەڵ تاق تاق کەرەکەدا هامڕاز بوون.

گۆرانی‌یەکەی ئەم لە گۆرانی منالێك دەچوو کە بەناو داربەڕوەکانی ئەوبەردا دەڕۆیی‌و لە ترسان دەیویست گوێی لە دەنگێ بێ، ئەگەر هی خۆشی‌بێ.

چاوە نوقومەکانی دەیان ڕوانی‌یە بۆشایی‌یەکی بێ کۆتایی، بە هەموو توانایەوە لە (هیچ)ەیەك ورد دەبۆوە کە خۆشی نەی‌دەزانی چی‌یە... بەڵام وێنەو ڕوداوەکانی سالێك لەمەو بەری بە شلەژاوی‌و تێکەڵی‌یەکی تەڵخەوە دەهاتن و دەچوون.

(ـ هەستە... با لە ژێر لقەدا پانت نەکەمەوە.

ـ من نیم، چیم داوە لەمانە.

ـ هەموتان وا دەڵێن.

نوکە شەقێکی قورس، تیژ، بە گوڕ درا بە ناو گەڵیداو ئیتر هەمانەیەکی قودراوی لە نێو هەردوو ڕانی‌دا دی‌یەوە.

ـ بۆ ڕەحم بەخۆت ناکەی، خوێندن و کەس وکارو ژیانت... ئاوات و حەزو گەنجی‌یەکەت، چی وا حوڵی کردوون؟

ـ ..

ـ ئاخر نامەرد...

بە دوای ئەمەدا زرمەیە درا بە تەوقی سەریداو لێشاوی گڕو بروسکە لە هەردوو چاوی‌یەوە دەرپەڕین و لە پەوڕوو کەوت.

(ـ دایە.. دایە، توخوا دایەگیان.

ـ وازی لێ‌بێنە قەحبە دایك، هەستە لەسەری با تۆش نەخەمە لای ئەو.

ـ توخوا... بابەگیان گوناحە... بەخوا ئەو بە زۆر ڕایکێشایە ژورێ، دایکم پێی وتم بچۆ باوکت بانگکە... ئای دایە گیان، خوێن.

لرخە لرخی دایکی‌و خوێن و تیلاکەی دەستی باوکی، قریشکەی خوشکەکەی‌و زیرو هوڕی کۆرپەی ناو بێشکەکە.

ـ دایە... دایە گیان... ئۆف خوایە.)

ـ عەلی... عەلی..

ـ ...

عەلی نە دەنگی دەکرو نە وەلامی هەبوو. گوێی قولاغ بوو... ڕوانی‌یە

ئەو لایەی کە دەنگەکەی لێوە دەهات و دورتر ڕوانی، دەستی چەپی کردە سێبەر بۆ چاوەکانیو ئیتر هەستا.

چوار ئافرەت، سیانیان ژن یەکیان کچ، دووانیان شەروالی پیاوانەیان لەخۆ هەڵ کێشابوو، تا قولەپێیان لە ڕیخ و سەنێری گەوردا بوو.

سەروتەنەکەی قوپاویش لە بن دەستدا... جگە لە (ناهی) کە بە قولینەیەکەوە وەستابوو.

لەبەر دەرگایەکی گەورەدا کەوتبوونە یەك و قسەیان دەهێنا بەسەر قسەدا، وادیارە دەمێکە یەکتریان نەدیوەو قسەو باسیشیان زۆرە، جا لەم باس بازیان دەدایە سەر ئەوی دیو ئەوەی پێشوویان بە نیوە چڵیو تەوانەکراوی بەجێ دەهێشت.

(حەیات) تەنەکەی بن هەنگڵی داناو دەستێکی بە خۆیدا هێنا. ڕوی کردە ناهیو وتی:

- ئەوە چیبوو، باوکت هەر نەیبریەوە؟

- بڵێم چی. چی بە دەست ئێمەیە.

ئەوەی دوایییانی ئاوێتەی هەناسەیەك کرد.

- دەمم نایگاتێ بڵێم خێرت دەگاتێ کچەکەت سوتا. ئەویش ئەمەی بە گاڵتەیەکەوە وت.

- ئۆی حەیات گیان، خۆ پیاو قاتی نەبووە.

حەیات ڕوی کردەوە بەولاداو دیسان بە کیییەکەوە هاواری کردەوە:

- عەلی، دەوەرە چیت کرد، باوان شێواو.

(ماڵێ) سەیرێکی عەلی کرد، بەرەو لایان دەهات، ڕوی کردە ئەوانی دیو وتی:

- وەرە باوان شێواو کەمێ بای باڵی خۆت بە، دەمێکیش لەگەڵماندا تەرکەی هەرباشە. دەڵێی

- ئۆی کاڵێ، ئەوەندە بە پەرۆشی دەڵێی مچەی مێردت خەساوە.

- نەخەساوە بەڵام.

- ئاخر (پەریزاد) ئەوەش مێردکردن، دەمن و کاڵێ چیمان فەرقە؟

حەیات کە ئەمەی وت هەناسەیەکی هەڵ کێشاو:

- بەڵام هەرچاك بوو، ئەگەر بمایە بوم و لە سایەیدا بوومایە هەر چاك بوو.

پەریزاد سیمای دڵ تەنگییەکی دەستکردی بە ڕویدا هێناو ئەو ڕەنگە ئاڵەی وەك تیشکی سەر شانۆیە گورج گۆڕییە سەر زەردباوێکی کز. هەناسەیەکی دایەوەو وتی:

- عەمرم نەمێنێ... خوا سەبەب کاری بگرێو لاڵ بم بوێ. کچێ خوا گەورەیە. جوان و جەهێلی. خۆ پیاو نەبڕاوە.

بە هاتنی عەلی قسەکەیان بیرچۆوە. سەرێکی گالۆکەکەی بە حوجەت دا بە زەویداو وتی:

- ئەوا هاتم... بزانم چیتان لێم دەوێ... سەرو ماچم دەدەنێ؟!

- وەی. دەڵێی بزنی حەجەی. سەرو گوێلاکت خواتەوە. پیاو نەما تۆ نەبی؟ بۆ ناچی بۆ لای... قسەکەی لێرەدا بڕی، بزەی سەر ڕوییو تەماشای کردە ریزە ماڵەکانی سەرەوەو هەموان دایانە قاقایەکی تاساو.

پەریزاد وتی:-

- بڵێ بزانم، توخوا عەلی لەگەڵ ئامۆزاکەت چیت کرد... شووت پێ دەکا یان تۆ ناتەوێ؟

حەیات لەولاوە پەستی دایگرت و عەلی وتی:

- نازانم ئەو وەختە شێت بێ بەڵام من هەر ناشچم بە لایدا.

حەیات لێرەدا پەستییەکەی ڕەوییەوە.

- بۆ شێت و وێت گوایە لەو باشتر دێنی؟

حەیات بەر لە عەلی وتی:

- ئۆف پەریزاد ئەم قسانە چین.

- نا، بەڵام تا کچ بوو هەر کە بەلامدا رادەبورد تفێکی دەکردەوە یا لچێکی هەڵ دەقورتاند، ئێستاش کە مێردەکەی مردووە وەختە بۆ پیاوێ شێت بێ، پێم دەڵێ عەلی گیان.

ئەوان لەمە پێکەنین، (زەکێ) تا زیاتر بیجوڵێنێ وتی:

- وابزانم دەڵێن ئەو ڕۆژە لە داڵانەکەیاندا دیبوویانی ماچت دەکرد... وایە؟

- هەر جارێك بوو... بەخوا خۆی دەستی کردە ملم و... بە زۆر.

سەری داخست و چاوەکانی بڕییە قوڵایی ئەو تەنەکە پەی بە دەستی زەکێوە بوو، دوایی سەری هەڵ بڕی، قسەکەی بە کاڵێ بڕیو وتی:

- تا نیوەڕۆیەکی درەنگ گەوری پێ ماڵیم و دوایی وتی دەوەرە با هەقی هیلاکییەکەت بدەمێ، ئیتر... ئیتر... دەستی کردە ملم و...

- عەلی، وەرە بزانم، لە ژندا حەزت لە کوێیە؟ بەم پرسیارە، زەکێ ویستی هەستی عەلی بوروژێنێو مەودای باسەکەیان فراوان کات، عەلی بە گێلییەوە وتی:-

- چی؟ خۆ مریشك نییە.

- نا شێتە. کوێی ژن زۆر جوانە؟

- ئا... بەخوا، ئەمەی.

دەستیشی برد بۆ سەر سنگی ناهیو ئەویش ڕاچڵەکیو:

- وەی هەتیو... باوان شێواو.

حەیات زۆر پەست بوو، ویستی کۆتایی بەم گاڵتە جارییە بێنێ:

- عەلی برۆ، لاچۆ با بەس بێ.

ئەمان لەمەدا بوون لەوسەرەوە شەگەلێك بە دوای دەڵەبەبایەکەوە بوون و بە پرتاو بە لای ئەماندا هاتن. دەڵەکە کلکی چەماندبۆوە ناو هەردوو ڕانیو بە سەرێکی شۆڕەوە تا بۆی دەکرا دەیویست ڕزگاری بێ.

گەماڵێکیش خۆی لێ نیزیك دەکردەوەو لوتی لێ نیزیك دەختەوە، ئەویشی ملی وەردەچەرخاندو حەپەیەکی تێکەڵ بە مرخەی دەهاویشتیو تەکانی بە خۆی دەدا. لەم ڕزگاری نەدەبوو یەکێکی دی ئەمبازی دەبۆوە. شتەکان کە لەودیو سنووری هەستەوە دەکەوتنەوە نرخ و پێزو چێژی نەبوو،

هەرچەندە هێشتا گەرم و گوڕو کاریگەر بوون.

عەلی، نە تریقەو قسەی خۆش و دیمەنی گەرمی ئەو ژنانە دەیبزواندو نە ڕوداوەکانی دەوروپشتیشی دەیهەژاند، ئەو لەو سنوورەدا بوو کە هەرچی تیادا ڕووی بدایە لە خۆشییەکی گەش و ئازارێکی تاڵ و تفت، ئەم کورکەی لێوە نەدەهات و نەش دەبزوا.

(ـ ئەوەندەی تۆ بیر لە مردن ناکەمەوە.

ـ بۆ، هۆش و فامت نییە؟

ـ دەشێ لە تۆ زیاتریش، بەڵام ئامانج هەر تەنیا ڕێگایەك نایگاتێ.

ـ دەبێ ڕاسترین و پاکترینیان بێ.

ـ دەمن وانیم... گوێی نادەمێ.

تا بەم قسانە هەستی دەکرد (ئەرپە)و (ژاڵە) ڕۆژ بە ڕۆژ لە یەك دور دەکەونەوە، ئەرپە وەك خۆشەویستی نەیدەویست ژاڵە لە بۆچوون و هەنگاونانەکانی ژیاندا ڕوویەکی ئەودیوی خۆی بێ، ئەمیش وەك کەسی سێیەم هیچی لەوە زیاتر پێ نەدەکرا کە نەهێڵێ دابڕانەکە ڕووبدات.

بەڵام ڕۆژ لە دوای ڕۆژ ژاڵە لە پێچ و پەنای ئەو ڕێیەدا کە دەیویست بە ئامانجی بگەیەنێ ون دەبوو، بەمەشەوە نەدەوەستا هەستی کرد، ئەو لە قوڕێکی لینجی خەستدا هەنگاو دەنێ.

ـ لێی دورکەوەرەوە.

ـ ماوەیەکە، بەسەردەچێ.

ـ تێناگەم.)

ئەو ئافرەتانەی دەوریان دابوو... بازنەکەیان تەسکتر دەکرد، هەناسەی گەرمیان دەکرد بە ڕوویاو دیمەنی پیاوێکی ڕەسەنی ئیسقان پانی توندو پتەو هەژاندبوونی، ئاو زابوە دەمیان و لێویان وشك هەڵاتبوو، لیکیان قوت دەدایەوە.

پەریزاد هەستی کرد لە دەمارەکانی مەمکییەوە شیر قەترە قەترە دەردەچێ، کاڵێ هەناسەی سوار ببوو وردە تنۆکی ئارەقە ناوچەوان و سەری لوتی گرتبوو، حەیات حەزی دەکرد ڕەدوی کەوێ‌و ئەگەر بۆ دۆزەخیش بێ لەگەڵی بڕوا، ناهی خاو ببوەوەو مشتی لە لێواری ئەستوری قولێنەکەی بن هەنگڵی گیر کردبوو، حەزی دەکرد لە گەرمادا جلەکانی بەری پارچە پارچە داکەنێ.

ـ لاچن... لاچن، ئێوە چیتان دەوێ، دەی بڕۆن ـ بە لای کارتانەوە چن.

عەلی بەردێکی ناوەختی خستە گۆمە مەنگەکەوە بازنەیەکی شلەژاوی وەدەرخست و خۆی قورتارکرد، بەرەو خوار بووە.

- ٢ -

زەوی لە بەردەمیدا کشا، ساف و دوورو درێژ، هەر وەك دیمەنی لە تابلۆکانی (سلفادر دالی)، خۆی لەو بیابانە بێ پایانەدا وەك خاڵێك دەهاتە بەرچاو، تینوو هیلاك و شەکەت، پەلی دەکوتا... لە دوورەوە تارمایی ئەرپەی هاوڕێی بەدی دەکرد کە ئەویش وەك ئەم لە فەلاکەت دا بوو.

(خۆ لەوەتەی لە شار لە یەکیان دابڕین ئەم چاوی پێ نەکەوتوەتەوە، ئاخۆ ئێستا چی بکاو لە کوێ بێ؟ ئاخۆ ژاڵە چی بەسەر هاتبێ، ئەرپە چەندی خۆش ـ دەویست.)

ڕۆی ڕۆی تا لە نیوەی ڕێگا خەونە دێرینەکەی هاتەدی، حەیات بووە هاوسەری‌و پێکەوە هەنگاویان دەنا.

ـ بەسە، ترسی خوا لە دڵتانابێ‌و بۆ وازم لێ ناهێنن!ـ دەمت لێك نێ شێتە، ئەگەر لە خوا بترسایتایە ئەو گوڵەباخەت بە خۆتەوە گیرۆدە نەدەکرد.

ـ بە یەك ڕازین چ هەقتان هەیە.

ـ گەوجە حەیات پیاوێکی دەوێ وەك ئەسپ، ئێستا چۆن ئەو بە تۆ تاقەت دەکری، هەموو گیانی تەڕی‌و حەزو خۆشییە، شێتییەکی سەیر لە چاوەکانیدا مەلە دەکاو لە دەرونەوە دەیورووژێنێ.

ـ ڕەسوڵ وازبێنە... جەرگە و یخوڵەت وا بە دەرەوەیە.

ـ یانی چی؟!

ـ من چیم هەیە تا لە دەستی بدەم... بەڵام تۆ باخ، دەغڵ ودان، ماڵات، تەراکتۆرو ماڵ و منداڵ و زەوی‌و...

ـ نارەسەن هەرەشە دەکەی.

ـ ڕەسوڵ شەرەف گرانە.

ـ ڕەسوڵ، ڕەسوڵ، دەڵێی لە سەپانی ماڵی باوکت دەخوری، هەتیو تۆ کەی ئەوەندە ژێربووی و ئەقڵت بە شەرەف شکاوە؟ سەد بریا زیندە بەچاڵ کرایتایەو دەرم نەهێنایتایە دەرەوە.

(ـ عەلی کوڕی چاکە... هەر بچووکی خۆتانەو چیش بڵێن سەری لە ڕێگەتانە، دەیخاتە سەر چاوی.

ـ تۆ دەبێ بە زامنی؟

ـ عەلی سافیلکەیەو لە خشتەیان بردووە، چاوی ئێمەی لێوە دیار نەبووە بۆیە، من دەیبەمەوەو چی دی ئاقڵ دەبێ.)

کە حەیاتی هێنا شتەکان چوونەوە دۆخی خۆیان، ژیان کاژێکی فڕێ‌داو بەرە بەرە عەلی لە ناو بەندایەتی مێشکی ئاساویدا ڕزگاری بوو.

حەیات هەر بە عەلی‌دا هەڵی دەڕوانی‌و چاوی ترس و پارانەوەشی دەکردە ئەو گەماڵانەی ناو ئاوایی، کە دەورو خولیان دەدا؛ جا لە شەوێکی فێنکی بەهارێکی دەرەنگدا بەرەو شار بوونەوەو وەك هەزارەها خەلکی دی تیا دانیشتن.

ئەو ساڵە هاوینەکەی دوورو درێژ بوو و پایز دواکەوت. مانگی تشرین دێرە... لە کوێستانان نیمچە زستانێکە بەڵام لێرە تازە ئەم شەو قازو قولینگ بەرەو خوار دەڕویشتن، ئاسمان ساف و هەواییەکی وەستاوی شێ‌داری کپ. قیقە قیقی قازەکانی ئاسمان بەوانی دی دەوت کە (بێ‌دەنگ بن لە ژێرمانا ئاوەدانی هەیە نەك بە شەوارەمان بخەن و سێ‌چوارێکمان لێ سەرەو

ژێر بینەوەو تیاچێت!)

ئەو بەیانی‌یە وەك جنۆکە دەستی لە شار وەشاندبێ ئاوا گۆڕرا، هەورە بروسکەو گێژەلوکەیەکی خوڵاوی قورس و کزەی سەرمایەکی تیژ لە ماوەی سەعاتێکدا شاری گرتە باوەش و جۆرە بڕوایەکی تری‌دا بەوانەی تیاد دادەنیشتن... بەوەی کە ئەمساڵ هێشتا گەرماکەی هاوین ئەو خاوو خلیچکی‌یەی لە لەشی خەڵکەکەدا هێشتبۆوەو بەتەنگ ئەو خۆئامادە کردنەوەوە نەبوون کە ساڵان دەیان کرد بۆ پایزو زستان، خۆ ساڵان زەخیرەی زستان لە پایزدا دوایی دەهات.

هەبوو بەمە پەست دەبوو، هەشبوو بە نیشانەی باو بارانێکی خێرو خۆشی دەزانی‌و ئاهێکی پیا دەهات و بە تەمای ئەو پەڵەیە بوو کە دواکەوت.

- ٣ -

کوڵانێکی تەنگەبەر دەچووە سەر شەقامێکی فراوانی سەرەو لێژ، ئافرەتێك دەرگایەکی تەختەی کردەوەو تەنەکەیەك زبڵی خستە بەر دەرگاکە، منالێك بە دەستەوارەیە نانی بازاڕەوە گەیشتبووە ئەوسەری کوڵانەکە، سێ مریشك و کەڵەشێرێك لە دەرگایەك کرانە دەرێ‌و دەستیان بە هەڵبەزینەوەو بەیەکادانی باڵەکانیان کرد.

سەربەستی چەند خۆشە.

گەماڵێکی زلەی بەڵەك، وەك راوانرابێ کلکی خستبووە سەر شانی‌و لەم سەرەوە هات و خۆی کرد بە سەری ئەو کوڵانەی کە دەرنەدەچوو، لە هەڕەتی هێزو توانایادابوو، بە پەلە دەڕۆی‌و وەك شتێ دەنگی ترپەی پێی دەهات، وریا، گوێی هەر بە تولەیی قرتێنرابوو... دیارە بۆ ئەوەی کە گەورە بوو دڕ دەرچێ، کەچی هەرواش دەرچوو بوو.

لە کوڵانەکەدا کەوتە بازنەیەکی داخراوەوە، خولێکی فراوانی خواردو هەر بە هەمان دەستوری توندی‌و حوجەت گەڕایەوە.

دەرگایە کرایەوەو کچێکی بۆشناخی رێك پێکی لەباری لێ هاتە دەر، باڵا بەرز، لەشێکی پڕو پتەو، قژ خورمایی بریسکەدارو بژ، چاوە ڕەشە گەورەکانی گێڕاو لە دووەم هەنگاوی‌دا دەمی داپچڕی‌و رەشێنەی چاوەکانی پەڕی‌یە ناوەڕاستی سینەکەی‌و کرانەوە، دوو چرچ لەسەر تەوێڵی کەوتنە ڕوو، لە قوڵایی‌یەوە (ئاهـ)ێك تێکەڵ قریشکەیەکی تاساو بوو دەرپەڕی...

سەگەکە لە ئاستیا وەستاو لە دەنگەکەی دەستی کردەوە بە ڕاکردن تا لە چاو ون بوو.

ئەم هەناسەیەکی پیا هاتەوەو ئاوێکی ساردی خاو زایە دەمی... سەری گێژی خواردو لێوی سڕ، قورس بوو، لەبەر خۆیەوە وتی:

- ئەمە چی‌بوو!

(ترس. ترس. ترس دایگرت و لەشی وەك ئەو پەپوولەیەی کە لە دەوری چراکە گرتی، ئاوا دەلەرزی، دەیزانی ئەمیان ئەرپەنی‌یە، ئەم ڕێگای سێیەمی لە لا نی‌یە، لە لای ئەم جیاوازی نی‌یە لە نێوان سەگە نازو لنگە فرتێ ئینسانێکی سەربڕراو... هەردووکیان بەرەو مردن دەڕۆن... ئەمەی دوایی مەبەستە سەرەکی‌یەکەیە لەلای... لە مردنیشدا ئەو ڕاستی‌یەیە کە دەرچوون لە دەستی وەك گرتنی تیشکی خۆرە بە چنگ.

لێوی لیکاوی لەسەر تەختی پشتی‌یەوە، خشاند بەرەو ژێر باڵی چەپی‌و لە نەرمایی‌یەکەی ژێر پەراسویدا دانەکانی خستە کار بۆ نەرمە گازێ.

- ئۆی... ئۆف.

- دەترسێ؟ بووکە شوشەیەکت بۆ بکڕم؟

- با ئیتر بەس بێ... تەواو، ناتوانم.

وەك هەموو جارێ گوێی نەدایەو بە لێوی لیکاوی هێڵی ڕاست و چەپی تەڕی لەسەر ئەم دیوو ئەو دیوی لەشی دەکێشا، دواجار بەرزبۆوەو سەری لەگەڵ لەشی ئەودا ئاوەژو بوو!!

حەیات لە درزی نێوان دوو لای پەردەی پەنجەرەکەوە تێی دەڕوانین و دزەنیگای دەکرد، ئەژنۆکانیشی دەلەرزین، بەڵام قیژەی مناڵە ساواکەی وەڕسی کردوو...)

چاکەتێکی قەیفەی قاوەیی‌و تەنوەرەیەکی دامەیی هەر بە هەمان ڕەنگ بەڵام تەختەکەی کاڵتری لە بەردا بوو، جوتێ پێڵاوی چەرم کە بە زنجیرێ لە لاوە دادەخرا، لە پێی کردبوون.

کراسەکەی ژێرەوەی خەنەیی‌و پارچەیە ئاڵتوون کە لە شێوەی نەخشێکی جوانی هونەرمەندانەدا کرابوو بە زنجیرێکی وردی گران بەهاوە هەر لە ئاڵتوون، بە ملیا شۆڕ ببوەوە، لە نێوان بەرزایی هەردوو مەمکیدا لە سەر کراسەکەوە گیرابووە یەکێ لە قۆپچەکانی.

(- چی تیایە، بڵێ دوو مانگە پانزە پانزەم لا داوەو ئەمەم پێ کڕیوە... حەیات ئاگادارە.

- دەزانم، بەڵام نامەوێ ببمە تەوەری گومان.

- خۆت گەورەی خۆتی‌و گومان لە دەوت نەماوە.

بەڵام دەیزانی کە کچێکی جوانی وەك ئەم هەر جێگای گومانە... ئەم خەڵکە زاڵمن!!)

که چووە سەری کوڵانەکە ترسەکە هەر لە سەرو سیمایدا بوو و دڵی دەکوتا، گێژاوی بایەکە کوڵێ تۆزو گەڵاو کاغەزە دڕاوی دا بە رویداو ئەم گورج دەستی کردە قەڵغانی بۆ دەم وچاوی. (- دنیا پڕ لە خراپە، چاکە زۆر کەمەو بە دەگمەن دڵسۆزێکت دەست دەکەوێت.

- لە لای تۆ وایە.

- بە تاقی‌کردنەوە بۆم دەرکەوتووە، نۆزدە ساڵە دەژیم بەڵام لە لێواری ژیان و مەرگدا، بە پێی پەتی بەسەر دەمەچەقۆیەکی تیژدا دەڕۆم.

- لە دنیایەکدا کە پارە دەستنیشانی هەنگاوەکانی مرۆڤ بکات دەبێ واَ بیر بکەیتەوە.

- ڕاستە بە هەر لایەکدا ڕۆیشتووم هەر کەرو جامبازو هەڵ خەڵەتاوم دیوە، زۆردارو بێ بەزەییو تاوانبار بەسەرمەوە وەستاون... بۆیە هەمــوو دەم تا بۆم کراوە خۆم پاراستــووە، هەرگیــز کەسێکم نەدی ڕۆژێ دەستێکی بەزەییو دڵسۆزیم بۆ درێژ کات.

- کەواتە با لەگەڵ تەوژمەکەدا بڕۆین!!

- ناچارین

- نابێ... ئەی من هەمیشــە چیت پێ دەڵێم... من دەمــەوێ کە بزانیو بروات هەبێ ئەم دنیایە هێشتا چاکەو ڕاستیو پاکی هەر تیا ماوە، دنیــا ئەگــەرچی ئێستــا وادەبینی بەڵام ئەمــە توف و ڕێــزنــەو گێژەڵوکەی پێش بارانە... دنیا دەشواتەوەو پاکی دەکاتەوە، هەرچی تۆزو خۆڵ و پوش و درکە ڕای دەماڵێ...- ئەرپە، بە قوربان، من نازانم دەتــەوێ چۆن بگــۆڕڕێم، مامۆستــاش هەر ئەم باســانــەی بۆ دەکردم، کتێبەکانیش هەروا دەڵێن، بەڵام دەوەرە سەر کردارو ژیانی ڕۆژانە.. لە قسە زیاتر نییە.

- قسە؟! ژاڵە تۆ زۆر دووریت لە ڕاستیو لەوە دەچێ لە لێواری داخزاندنابیت!

- ئەم هەمووە بە تۆ ڕاناگیرێن تا دانەخزێن.

- کە من تۆم گرت وەك هەمووم گرتبێ وایە.

- هەڵەکانت ئا لێرەدایە، دەبێ من چیبم لە چاو ئەم عەشاماتە خەڵکە.

- ئەم عەشاماتە لە تۆو من و ئەوانی دی پێك هاتووە... گەر ئێمە نەبین ئەویش نابێ.

- نازانم، بۆ لا نادەی، هەمــوو کەسێکی وەك ئێمــە هەر کە بەیــەك دەگەن لەم باسانە زیاتر چی تریان نییە؟... بوو بە چی.

- شتی کە زۆرە بەڵام ئەمانە سەرەکین.)

ئاوڕێکــی دایــەوە، ڕووی کردە ئەو لایــەی کە دەچێتــە سەر شەقامەکە. حەیات عەباکەی دابوو بە نوکی سەریداو جامێکی بچوك ماستی بە دەستــەوەبــوو، بەرەو ڕۆژوی هات... جوان و خرپن و گەشاوە، پێکەنیو ئەو وتی:

- گوڵە گیان ئەوە بۆ وات لێ هاتووە؟!

- نازانم سەگێکی زلە تۆقاندمی!

- چی... سەگی چی؟، ئەرێ ڕۆی؟

ئەمەی دوایی بە چرپەیە وت و سەیرێکی لای ماڵەوەی کرد.

- دەمێکە، هەر هاتمە دەرێو لە بەردەممدا سەگێکی زلە قوت بۆوە، حەیات گیان زۆر ترسام.

بە دەم جیــابــوونــەوەوە ئەمــەی وت، بەڵام حەیــات شتێکی دی تەنــەڵــەی بە خانــەکــانی بیــرکــردنەوەی مێشکی دەکرد، وەك شریتێك دوای سەدبارە لێی داتەوە ئاوا لێ‌درابەوە:

(خــۆ کە ژوری سەر داڵانــەکــەی دایــە لە ناچاریو بێ پارەییدا نەبوو، ئەگەر بۆ هاودەمێکیش بێ کە لە ماڵەکەدا لە گەڵیدا بێ ئەوە خۆ هەر لە تەنیاییدا کاری ئەم مەیسەر دەبێ.

عەلی بە پەرۆش بوو کە لە گەڵماندا بێ:

- خۆشەویستی ئەرپەی برادەرمەو نامەوێ لە لایەکی تر جێی بێتەوە، ئەرپە وەك ماڵی برای خۆی دادەنێو دەتوانێ دڵنیابێ لێی... حەیات نازانی من و ئەرپە لەگەڵ یەك چۆن بووین... ئەرپە گەوهەرە.

لەوە دەچــوو ئەو لەوڕێیــەوە نەڕوات کە ئەم حەزی پێ دەکات... وای دەزانی هێشتا بارەو هیچ نەزانە، بەڵام...)

ئاوڕێکی بۆ دایــەوە، هەر لەو کاتــەشــدا ئەویش ئاوڕێکی لەم دایــەوەو ڕوانینیــان وەك دوو تۆپــەڵــە بەفــری دەستی دوو منــاڵ کە بۆ یەکتــری بهــاون ئاوا لە بۆشــایی نێــوانیاندا لە یەکی داو پەرش و بڵاو بۆوە... حەیات وەك تەریق بێتەوە گورج ڕووی وەرگێراو ڕووی.

هەرچی ئەوبوو درەنگتر ڕوی وەرگێرا:

(لە ماڵی عەلیت باشتر بۆ ڕێ ناکەوێ، بچۆرە لایو وابزانە لە ماڵی خۆتــانی؛ حەیــاتی ژنی لەو ئافرەتــانــەیــە پشتی پێ دەبەسترێو ئیشیش مەیسەر دەکات.

ئەو گرێکوێرەو بەندو باوی لەلا نییە، ئەو دەزانێ چۆن ڕەفتار لەگەڵ هاودەردو ئازاریدا دەکات.

عەلی بە ڕۆژ کرێکارەو بە شەو بە دیار ئەو بینایانەوەیە کە دروست دەکــرێت، جا چ لەوە باشتــر دەبێ کە یەکێکی وەك تۆ لە ماڵــەکــەدا لەگەڵیاندا بێت.

- ئەمە کێیە؟

- ئامۆزای ئەرپەیە.

- ئەی لەگەڵ خۆی بۆ نایەت؟!

- وارێ دەکەوێ

- باوەڕ دەکەی کۆکی لەگەڵیدا.

بۆ بن برکردنی گومان دەبێ نرخەکە بەربێتەوە، لەمەش بەرزتر تا بە ئەرپە نەڵێ.

- ئەرپە کێیە؟

- ئەوسا... دوای کڵاوی با...

- دەزانم... بەڵام وا دیارە هاتوتە ئێرەش؟

- یەك دوو جار، بۆ؟

- هیچ تەنیا پرسیارێك)

لەســەر شۆستــەی شەقــامەکەو لە بن دارتویەکدا کچەکە هەنگاوی ناو دیــــان بۆ جاری دووەم، لەو بەیــانیــەدا، داچڵەکیــەوە، دڵی

خورپەیەکی کردوو ئەمجارە نەگەیی قریشکەکە بکات.

که ئەرپـەی دی چاوی دوای جولاَنـدنـی دەسـتـی کەوت، لە کیـسەیەکی زەردباوی کاغەزدا دەمانچەکەی دەرهێناو ئیتر لولەکەی تێ کرد... ئەم بچووك و باریك بۆوە تا خۆی بکا بە ناو لولەکەداو ئەو تاریکایی‌یە بگرێ، نەیەڵێ‌و ساتە پڕ مەترسی‌یەکە بوەستێنێ.

(- وازبێنە تۆو ئەوانەیان نەوتووە.

- هەر من نیم.

- تۆ ئێستا لە زەلکاوەکەدای.

- سەربەستم.

- سەربەستی‌و سنوری ئەو شتەو بەکارهێنانی‌و زۆر شت، هەمویم لە یادەو قسەو باسی چەند ڕۆژێکمان بوو.

- کەواتە چیت لێم دەوێ؟

- دەمەوێ ڕاست و ڕەوان بڕۆی.

- چونکە جارێکی دی ئاوا ماوەی قسەکردنیشت نادەم!

- هە هـ... شێتن).

ئەوەندە بچوك بۆوە لەوەدابوو بچێتە ناو لولەکەوەو بە تاریکایی‌دا بکشێ، بەلاَم تۆپەڵێ ئاگرو قورقوشم دای بە دواداو خستی‌یەوە سەر قەبارەی خۆی، خۆی کرد بە لای چەپی گەردنیاو لە ئێسقانی پشتی ملیدا گیرسایەوە، تیژ وەك بروسکە، گەرم وەك پشکۆ.

بە دوای‌دا یەکـێـکـی دی بەلاَم بەرزتـر، بڕۆی چەپـی سمـی‌و ڕۆچـووە ناوەوە تا لە مێشکـە بچکـۆلـەیـدا وەستـاو زۆر لە ڕوداوو کارەساتەکانی بیست ساڵ لە تەمە ی سڕی‌یەوەو وردو خاشی کردن.

حەیات کە دەرگاکەی کردەوەو چووە ژورێ، لەگەڵ داخستنەوەیدا دوو تەقـە هات و دنیـا کپ بوو، هەتـا چۆلـەکـەکانی سەر تووی ناو حەوشەکەش لە جریوە کەوتن.

وەك پالێکی پی‌وە بنێ بە پشتا ڕەتێکی بردو هەموو شت لە پێش چاوی تێکـەڵ بوو، ڕێبوارەکـانی سەر شەقـامـەکە وەڵ دارتووەکەی نـزیکی - کە ویـستی دەستی پێـوە گرێ - کشـان و دوورەوەکـەوتن، ویـستی کەوتنـەکـەی وا نەبێ ئازاری بدا بەلاَم لە‌ه دەرچـووبـوو کە خۆی ڕاگیرکات... ئا لەو ساتەدا وشەکانی ئەرپە زیندو بوونەوەو دادەبـارین بە سەریـدا... لە گوێی کاسیـدا زرنگـەی یەك لە دوای یەکیـان دەدایـەوە. چاوەکـانی فرمێـسـك و خوێن تیـایاندا قەتیس ماو لێـوەکـانیشی بە هەمـوو توانـایانەوە دەیانویست ئەو وشەیە دەربڕن کە قورگی خوێناوی هێنا بووی... پارانەوە، هاوار، خۆزگە، ئاخ یان ئوف... کەس نەیزانی کامیان بوو کە بەر لە خاوەنەکەی مرد.

(هـاوەڵـەکـانـی پەرداخـی ئاویـان بۆ ڕاگـرت و یەك یەك زەردەخەنەیەکی سەرزەنشتیان ئاراستە دەکرد، دایە پرمەی گریانێکی بە کوڵ، ڕێك و ڕەوان دەیزانی کە ئیتر هەموو شت تەواو... بەلاَم ئاخ بۆ تنۆکێ ئاو).

کە مردن دێ‌و سنورە مەزنەکەی نێوان بوون و نەبوون دەکێشێ، دەچێنـەوە دۆخـە ئەسڵی‌یـەکـەی خۆمان، ڕەنگە سروشتی‌یە دێرینەکە سەر ڕوومان دەگرێ، ئەو هەموو فیزو خۆبەشت زانینە، دەماخ هەوا بەرزی‌یە، ڕق و ئارەزووە، ئەوساو ئێستاو داهاتوو، هەمووی لەگەڵ ئەو پارچە ڕۆژنامە زەردە دڕاوەی بایەکە هێنای‌و کردی بە ژێر سنگی‌دا یەکسـان دەبن، جا ئەوسا تك تك خوێنێکی گەشی گەرم بە کەمێ کەفی ئاڵەوە ڕژایە سەری‌و دێڕ دێڕ شتە نووسراوەکانی سەری دادەپۆشی.

پارچـە ئاڵتـونـەکـەی ملی لە قۆپچـەی کراسەکەی ڕزگاری بوو و ئەویش کەوتە سەر چیمەنتۆ ساردەکەی شۆستەکە، جانتا چەرمەکەی دەستی پەڕی بۆ دووورر لە خۆی.

لە قولاَیـی ناوەوەیـدا زەردەخـەنـەیـەك وەك شەپـۆلـی هات و سەرلێـوەکـانی گرت. لەوە دەچـوو کە مانـای ئەوە بدات گوایـە ئەشکەنجەی ژیان بەری‌داو لێی جوێ بۆوە.

ڕوومـەتی چەسپـابـووە سەر چیمـەتنوکەو پەنجەکانیشی ئازارێکی کوشنـدەیـان دەردەخـست، وا لە عەردەکـەی گیـرکـردبوون کە نینۆکە درێژەبۆیەکراوەکانی یەك یەك بەپشتا شابوونەوە.

(کە مردن دێت، هەمووشت دەست بەرداری ئادەمی دەبێ، جگە لەو لەشە نەبێ کە هۆی نەهامەتی‌یەتی.

- ئەی گیان... گیانەکە چی لێ‌دێ؟

- دەڕوا... بەرز دەبێتەوەو دەچێتەوە بۆ ئەو جێ‌یەی لێی هاتووە.

- بۆ کوێ؟

- بۆ سەرەوە... بۆ ئاسمان)

دە هەر لەو سا ەدا چاوەکانی لە مۆلەقە کەوتن و ئەبلەق بەرەو ژوور بوون، وەك بیـانـەوێ دوای گیـانـەکـەی بکەون، کە لە بۆشایی‌یەکی بێ‌کۆتایی‌د بەرز دەبۆوە.

هەر دە‌ای ئەمە.

شەپۆلێکی تری بایەکە هات و قەفێ لە قژە خورمایی‌یە بریقە دارەکەی بەسـەر ڕویـدا پەخش کردەوە... ڕووی ترسنـاکی لەو خەڵکـەی دەورووپشتی شاردەوە.

لە خەستـەخـانـە، کە بردیـانـە ژورەوە پاسـەوانێك بەهەڵی زانی‌و پارچە ئاڵتۆنەکەی ملی ڕاتەکاند، بە زنجیرە وردە گرانبەها کەشەوە، لە چاوتروکاندنێکا خستی‌یە قولاَیی گیرفانی قەمسەڵەکەی! هەر دوای ئەمە.

ژیان وەك خۆی بەردەوام بوو.

ئەرپەو عەلی بێ‌ترس بەناو داربەڕوەکاندا دەڕۆیشتن.

خورپەیەکی کردوو ئەمجارە نەگەیی قریشکەکە بکات.

کە ئەرپەی دی چاوی دوای جولاندنی دەستی کەوت، لە کیسەیەکی زەردباوی کاغەزدا دەمانچەکەی دەرهێناو ئیتر لولەکەی تێ کرد... ئەم بچووك و باریك بۆوە تا خۆی بکا بە ناو لولەکەداو ئەو تاریکاییە بگرێ، نەیەلێو ساتە پڕ مەترسییەکە بوەستێنێ.

(- وازبێنە تۆو ئەوانەیان نەوتووە.

- هەر من نیم.

- تۆ ئێستا لە زەلکاوەکەدای.

- سەربەستم.

- سەربەستیو سنوری ئەو شتەو بەکارهێنانیو زۆر شت، هەمویم لە یادەو قسەو باسی چەند ڕۆژێکمان بوو.

- کەواتە چیت لێم دەوێ؟

- دەمەوێ ڕاست و ڕەوان بڕۆی.

- چونکە جارێکی دی ئاوا ماوەی قسەکردنیشت نادەم!

- هە هـ... شێتن).

ئەوەندە بچوك بۆوە لەوەدابوو بچێتە ناو لولەکەوەو بە تاریکاییدا بکشێ، بەلام تۆپەڵێ ئاگرو قورقوشم دای بە دواداو ختییەوە سەر قەبارەی خۆی، خۆی کرد بە لای چەپی گەردنیاو لە ئێسقانی پشتی ملیدا گیرسایەوە، تیژ وەك بروسکە، گەرم وەك پشکۆ.

بە دوایدا یەکێکی دی بەلام بەرزتر، بڕۆی چەپی سمیو ڕۆچووە ناوەوە تا لە مێشکە بچکۆلەیدا وەستاو زۆر لە ڕوداوو کارەساتەکانی بیست ساڵ لە تەمەنی سڕییەوەو وردو خاشی کردن.

حەیات کە دەرگاکەی کردەوەو چووە ژوورێ، لەگەڵ داخستنەوەیدا دوو تەقە هات و دنیا کپ بوو، هەتا چۆلەکەکانی سەر تووی ناو حەوشەکەش لە جریوە کەوتن.

وەك پالێکی پێوە بنێی بە پشتا ڕەتێکی بردو هەموو شت لە پێش چاوی تێکەڵ بوو، ڕێبوارەکانی سەر شەقامەکە وەك دارتووەکەی نێزیکی - کە ویستی دەستی پێوە گرێ - کشان و دوورەوەکەوتن، ویستی کەوتنەکەی وا نەبێ ئازاری بدا بەلام لەوە دەرچووبوو کە خۆی ڕاگیرکات... ئا لەو ساتەدا وشەکانی ئەرپە زیندو بوونەوەو دادەبارین بە سەریدا... لە گوێی کاسیدا زرنگەی یەك لە دوای یەکیان دەدایەوە. چاوەکانی فرمێسك و خوێن تیایاندا قەتیس ماو لێوەکانیشی بە هەموو توانایانەوە دەیانویست ئەو وشەیە دەربڕن کە قورگی خویناوی هێنا بووی... پارانەوە، هاوار، خوزگە، ئاخ یان نوف... کەس نەیزانی کامیان بوو کە بەر لە خاوەنەکەی مرد.

(هاوڵەکانی پەرداخی ئاویان بۆ ڕاگرت و یەك یەك زەردەخەنەیەکی سەرزەنشتیان ئاراستە دەکرد، دایە پرمەی گریانێکی بە کوڵ، ڕێك و ڕەوان دەیزانی کە ئیتر هەموو شت تەواو... بەلام ئاخ بۆ تنۆکێ ئاو).

کە مردن دێو سنورە مەزنەکەی نێوان بوون و نەبوون دەکێشێ، دەچینەوە دۆخە ئەسڵییەکەی خۆمان، ڕەنگە سروشتییە دێرینەکە سەر ڕوومان دەگرێ، ئەو هەموو فیزو خۆبەشت زانینە، دەماخ هەوا بەرزییە، ڕق و ئارەزووە، ئەوساو ئێستاو داهاتوو، هەمووی لەگەڵ ئەو پارچە ڕۆژنامە زەردە دراوەی بایەکە هێنایو کردی بە ژێر سنگیدا یەکسان دەبن، جا ئەوسا تك تك خوێنێکی گەشی گەرم بە کەمێ کەفی ئاڵەوە ڕژایە سەریو دێڕ دێڕ شتە نووسراوەکانی سەری دادەپۆشی.

پارچە ئاڵتونەکەی ملی لە قۆپچەی کراسەکەی ڕزگاری بوو و ئەویش کەوتە سەر چیمەنتۆ ساردەکەی شۆستەکە، جاتنا چەرمەکەی دەستی پەڕی بۆ دووووور لە خۆی.

لە قولایی ناوەوەیدا زەردەخەنەیەك وەك شەپۆلی هات و سەرلێوەکانی گرت. لەوە دەچوو کە مانای ئەوە بدات گوایە ئەشکەنجەی ژیان بەریداو لێی جوێ بۆوە.

ڕوومەتی چەسپابووە سەر چیمەنتۆکەو پەنجەکانیشی ئازارێکی کوشندەیان دەردەخست، وا لە عەردەکەی گیرکردبوون کە نینۆکە درێژەبۆیەکراوەکانی یەك یەك بەپشتا شابوونەوە.

(کە مردن دێت، هەمووشت دەست بەرداری ئادەمی دەبێ، جگە لەو لەشە نەبێ کە هۆی نەهامەتییەتی.

- ئەی گیان... گیانەکە چی لێدێ؟

- دەڕوا... بەرز دەبێتەوەو دەچێتەوە بۆ ئەو جێیەی لێی هاتووە.

- بۆ کوێ؟

- بۆ سەرەوە... بۆ ئاسمان)

دە هەر لەو ساتەدا چاوەکانی لە مۆلەقە کەوتن و ئەبلەق بەرەو ژوور بوون، وەك بیانەوێ دوای گیانەکەی بکەون، کە لە بۆشاییەکی بێکۆتاییدا بەرز دەبۆوە.

هەر دوای ئەمە.

شەپۆلێکی تری بایەکە هات و قەفێ لە قژە خورماییە بریقە دارەکەی بەسەر ڕویدا پەخش کردەوە... ڕووی ترسناکی لەو خەڵکەی دەورو پشتی شاردەوە.

لە خەستەخانە، کە بردیانە ژورەوە پاسەوانێك بەهەلی زانیو پارچە ئاڵتونەکەی ملی ڕاتەکاند، بە زنجیرە وردە گرانبەها کەشەوە، لە چاوترووکاندنێکا ختییە قولایی گیرفانی قەمسەڵەکەی! هەر دوای ئەمە.

ژیان وەك خۆی بەردەوام بوو.

ئەرپەو عەلی بێترس بەناو داربەڕوەکاندا دەڕۆیشتن.

## چیرۆك

# لە ئیتاليا

■ مكسيم گۆرگی ■

فؤاد حسين كردويەتی بەكوردی



لە ئێسگـەیـەكی چكـۆلـەی نێـوان رۆمـاو جەنـەوەدا چاودێـریكـاری پوولـەكـان دەرگای ئەو دەستەیەی كردەوە كە ئیمەی تێدا بووین بە هۆی بۆیەچی‌یەكی روو گرژەوە پیرێكی كوت و كوێری لاوازی بە ژووردا كرد.

هەردووكیـان بەزەردەخـەنـەو ناسكی و خۆشی‌یـەوە وتیـان «گەلێ پیرە!»

بەلام پیـرە یەكـەمجـار پیاوێكی دۆزی‌یەوەو بە دەستە رەق هەلاتووەكەی گازندەی لە هەردوو یارمەتیدەرەكەی كرد پاشان تەپلە قوپـاوەكەی بەسەنگینی و رووخۆشی‌یەكەوە لەسەر سەرە سپی‌یـەكـەی بەرزكـردەوەو ئینجـا بەتـاكـە چاوێكی بەووردی سەیری شوێنەكانی كردوووتی:

«رێگەم دەدەن؟»

خەلكـە كە رێگـەیـان دا.. دانیشت پالی لێ دایـەوە.. هەردوو دەستی نایـە سەرئـەژنـۆ ئارەق كردووەكـانی.. زەردەخەنەیەكی وشك كەوتە سەردەم و لێوی كەدانیان تێدا نە مابوو.

برادەرەكەم لێی پرسی:

«باپیرە.. بۆكوێ دەچیت؟

پیاوە پیرەكە گورج وتی:

«ئای، نا. هەرسێ ئێستگە لێرەوە. هەرئەوەندەیە.. ئەچم بۆ ئەوەی شایی كورەزاكەم ببینم...»

پاشی چەنـد چركـەیـەك، لەگـەل ئاوازو بەزمی نالـەی پێچكـەی شەمەندەفەرەكە وەك چلێكی شكاوەی دەم گێژەلوكە بە چەپ و راستا لایدەكردەوە و قسەی بۆ دەكردین و وتی:

«من لیگـۆریم» ئیمـەی لیگـۆری بەتواناو بەكارین. هەر ئەمـاشـای من بكـەن. سیـازدە كورو چوار كچم هەیـەو ژمـارەیـەكیش كچەزاو كورەزام هەیـە كە نازانم ژمـارەیـان چەندەو ئەمە دووەم كچەزامە كەژن دەهێنێ. ها.. باشە؟»

ئیمـەش بە جووتـە لە چاوە تەنیـاكەی ورد دەبینەوە.. لێل بووبوو بەلام هێشتا گەشی تێدا مابوو پێ‌كەنی و وتی:

ئەماشام كەن بۆ پاشاو بۆ وولاتەكەم چیم خستۆتەوە پاشان وتی:

باشە چۆن چاوم لە دەستدا؟ ئەمە دەگەرێتەوە بۆ ماوەیەكی دوورو درێژ. ئەو دەمە منـدالێكی بچـووك بووم. یارمـەتی باوكم لە نان پەیـداكـردنـدا دەدا. رۆژێـك لە رەزەكـەدا وارێكـەوت باوكم زەوی دەكێلا. زەویش لای ئیمـە رەقـەو بەردەلانی‌یـە ئەوی كاری تێـدا دەكـات دەبێ زۆر وریـابێ و ئاگـاداری خۆی بكـات.. چەند پارچە بەردێ لەدەم نووكی

پاچەکەی باوکمەوە دەرپەرین و دایان بە ناوی چاومداو ئیستاکە بیرم نایە کە چەند ئیشم پێگەیی بەلام ئەوەم لەیادە ئەوڕۆژە کە نانی نیوەڕۆم دەخوارد چاوم لە شوێنی خۆی خزا . . بەرێزان ئەمەش زۆر بە سام بوو . ویستیان بیخەنەوە شوێنی خۆی و ئەم کارەشیان بە پارچە نانێکی گەرم چارەسەرکرد کە لە سەرچاوم دایاننا . بەلام زۆری نە برد کە چاوم بە تەواوی لە دەست چوو! »

پیاوە پیرەکە بەتواناو خێرا خێرا رووەمتە رەنگ پەریوە تاریك و چرچ و لۆچەکانی هەڵ ئەگولوفت پاشان زەردەخەنەیەکی خۆشی وشك جارێکی تر دایگرتەوە .

ـ وەك ئەمرۆ ئەوسا ئەوەندە پزیشك نەبوو . . خەڵکی بەبێ مێشکی و نەزانی دەژیان . ئای . بەڵێ . بەلام رەنگە دڵ و دەروونیان باشتر بوویێ وانیە؟

بۆ چوونێکی فیلبازانەی نالەبار دەم و چاوە کوێرەکەی کە پارچەیەك چەرمی پڕ چرچ و لۆچ بوو . قژە خۆڵەمێشی یەکەی داگرت کەلە کۆپەلێکی بوگەنی دەکرد .

«جا ئەگەر دەستی دا بە قەدەر ئەوەی من ژیام ئیوەش بژین . ئەو دەمە دەتوانن راستی لە هەموو کەسێ بگەن . ئێوەش و انالێن؟ بە پەستیەکەوە پەنجەیەکی رەش دا گیرساوی خواری بەرزکردەوە هەروەك بیەوێ یەکێ تەمێ بکات ـ «گەورەکەم ئیستا دەربارەی خەڵکی شتێکتان پێ دەڵێم . . . » «من سیازدە سالان بووم ئیستا لەو سا لاوازترو بچکۆلەترم . هەر لەو هەردەتەدا لە کاردا گورج و گۆل بووم ماندوو بوونم نەدەزانی چییەو باوکم هەرئەمەی بۆ بەجێ هێشتم . چونکە ئەو پارچە زەوی و خانووەی کە هەیبوو بۆ دانەوەی ئەو قەرزانە فرۆشران کە لە سەری بوون . بەم جۆرە بە تاکە چاوێك هەردوو مەچەکەکانم لە هەرکوێ یەك کارێکم بوۆزیایەوە دەژیام . . . سەردەمێکی ناخۆشی بوو . . بەلام هەرزەکار گوێ بە ناخۆشی نادات . . وانی یە؟

«کە تەمەنم نۆ سالان بوو تووشی کچێ هاتم واریکەوت کە خۆشم بوێ . ئەویش وەك من هەژار بوو . . بەلام کچێکی کەڵەگەت لەمن بەهێزتر بوو . لەگەڵ دایکە پەککەوتەکەی دا دەژیا . ئەویش وەك من هەموو کارێکی دەکرد کە بیدرایە . . رێبازێکی تەواوی نەبوو . . بەلام دڵ و دەروون باش بوو لە سەر و لەشی یەو سەرێکی تێگەیشتوانەی هەبوو . . . نەك هەرئەوە دەنگێکی خۆشیشی هەبوو . هەروەکو گۆرانی بێژێکی لێهاتوو بێ ئای کە گۆرانی باشی ئەزانی و دەنگ خۆشیش شتێکی بەچێژ و بەنرخە . منیش خۆم دەمزانی گۆرانی باش بڵێم «رۆژێ لێم پرسی شوو دەکەیت؟

«بەسلەمینەوە وتی . . کوێرە ئەمە کارێکی ناپەسەندو کەرانە ئەبێت ! چونکە هەریەکە لە ئێمە ـ من و تۆ ـ هیچمان نی یە . چۆن دەتوانین بژین؟ »

«راستی یەکەشی وابوو . نە من نە ئەو هیچمان شك دەبرد . بەلام ئایا هەرزکارێك و کچێ هیچ پێویستی یەکیان بە خۆشەویستی نیە؟

باش ئەزانن کەچی دەڵێم ناڵێم دڵداران خۆشەویستیان بەسەرنابەن .

بەم جۆرە سووربوون و تیم گەیان کەمەبەستم چی یە .

«ئەنجام وتی کەواتە . . باشە . رەنگە تۆ راست بکەیت . . ئەگەر مریم ـ یارمەتی تۆشو یارمەتی منیش بدات . ئیستائێمە لە یەك جیاین گومانی تێدا نی یە کە ئەگەر بیەوی بەیەکەوە بژین دەست دەداتە باڵمان! »

بەم جۆرە چوینە لای قەشە

«قەشەکە وتی . ئەمە شێتی یە . باشە بۆ لە لیگور بە ئەم هەموو سوالکەرو دەست برانە بەس نین؟ ئەی گیان لەبەرە کولۆلەکان . . ئێوە ئەهریمەن یاریتان پێ دەکات نەیەڵن لە خشتەتان بیات . ئەگینا ئەم لاوازی یەتان لەسەرتان زۆر دەکەوێ : »

کچ و کوری گەرەکە کە گاڵتەیان پێ کردین . پیرەکان بێ دەنگ بوون بەلام لاو بەو جۆرەی کەدەیەوێ کەللە رەق و زانایە! کاتی چوونەپەر دەهات . ئەو رۆژەمان لە رۆژانی کۆنتر دەولەمەندتر نەبووین بگرە نەشمان دەزانی لە کوێ ئەوشەوە بەسەربەرین . . . «ئیدا وتی : بابچینە رەزەکان . . بۆ نەچین؟ مرۆڤ لە هەرکوێیەك بێ مریم بەزەیی پێدا دێتەوە «بەم جۆرە رێکەوتین . کە زەوی راخەین و ئاسمان بدەین بە خۆماندا .

گەورەکانم ئیستا چیرۆکێکی تر دەست پێ دەکات ، وا چاکە گوێم لێ بگرن چونکە باشترین چیرۆکی هەموو ژیانمە :

شەوی بوك و زاوایەتی بۆ بەیانی جیوڤانی پیر وتی: -
ماوەیەك زۆرنا لە جرسین هامسین کارم لاکرد. نەشی دەویست باسی ئەم شتە بچووکانە بکات: -

«ئوگو، ئەبێ ئەو ژوورە کۆنەی مەرەکانی تێدابوو پاکی بکەیتەوە، ژوورەکە وشکە چونکە سالێك زیاترە مەرەکانی سەریان پێدانەکردووە. کای پاکی تیا بلاوکەرەوە بەلام ئەگەر ئیدا ویستان تیا دانیشن باشتر وایە پاکی بکەیتەوە.

«ئەوێ بووە مالمان!

«کە من خەریکی پاککردنەوەی ژوورەکەبووم و بەدەم کارەکەوە هەندێ گۆرانیم دەوت سەرنجم دا ئەبینم کۆستاتزۆی دارتاش دووکانەکەی خۆی بەجێ هێشتووەو راوەستاوە... پێ‌ی‌وتم! وادیارە تۆو ئیدا لێرە دائەنیشن؟ باشە ئەی رایەختان کوا؟
مەبەستم ئەوەیە کەی لە پاککردنەوەی ژوورەکە بویتەوە بێتە لام بتدەمێ.»

«کاتێ من ئەمویست بچمە لای، ماریای دووکانداری درندەی هەلەوەر هاواری کرد.

«ئەم دوو شێتە دەبنە ژن و مێردو نەپێخەفیان هەیە نە پشتی! کوێرە تۆ شێتی، بەلام بووکیم بۆ بنێرە...»

«ئیتورڤیانۆ، پیاوە شەلەکەی تاوباداری پەکی خستبوو، لە بەر دەرگاکەی خۆیەوە بەماریای وت:

لێ‌ی بپرسە بۆ میوانەکانی بادەی چەندە پاشەکەوت کردووە؟ کە ئەمەی گێرایەوە وتی: ئاخ، ئەبێ زەلام بۆتا ئەم سنوورە دەربەست نەبێ!»

فرمێسکێکی رووناك بەیەکی لە چرچە قوولەکانی روومەتیا هاتە خوارێ، سەری بەپشتا خست، بێ دەنگ پێکەنی ئیسکی قورقوراگەی شڵوا پێستە وشك هەلاتووەکەی لەرزی «ئای گەورەکانم، گەورەکانم،» کە ئەمەی ئەوت خەریك بوو لەبەر پێکەنین گەروڤی بگیرێ‌و وەکو منداليش دەستی رادەوەشان. جابۆ بەیانی ئاهەنگێران هەرچیەکمان پێویست بوو لەمالەکەدا لامان کۆبووەوە - لە پەیکەری مریم و.. تەشت و قاپەو قاچاخ و کوتالی کەتانی‌و هەمووشتێ. سوێتان بۆ دەخۆم ئیدا پێکەنی‌و گریا، هەروەها ئەوپێکەنی‌و من گریام - خەلکە کە هەموو پێکەنین - چونکە باش نیە رۆژی شایی زەلام بگری لێرەدا کەس و کارو هوزەکەمان هەموویان پیمان پێکەنین!

گەورەکانم! تاسنوورێکی بی‌وەی جوانەکەمافی ئەوەت هەبێ کە خەلکی ناوبنێ‌ی کەس و کارو هوزت. لەوەش باشتر ئەوەیە کەوا هەست بکەیت ئەوا نە کەس و کارو هوزتن. واهەست بکەیت لێتەوە نزیکن، لات پەسەندن و ئەمانە ئەوانەن ئەماشای ژیانت وەکو شتێکی هیچ و پووچ یاخود گالتە پێ‌کردنەوە ناکەن!

«ئای کە چۆن شایەك و چ رۆژێ‌بوو! دانیشتوانی گەرەکە کە هەموویان ئاهەنگەکەیان بینی. هەریەکەیان ملی نابۆ ئەو تەویلەیەکە لە چاوترکاندنێکدا بووە مالێکی پۆشتەو پەرواخ و رازاوە.. هەمووشتێکمان هەبوو! بادەو میوە، گۆشت و نان هەموان خواردیان و هەموان بەختیار بوون...
ئەمەش گەورەکانم لەبەر ئەوەیە لەوە بەختیاری‌ترنیە کە دەستی خەلکی بگریت و یارمەتی بدەیت، بروام پێ بکەن لە وەنایاب ترو جوانتر نیە!

«قەشەش هات. وتارێکی شیرینی داو تیایدا وتی: «ئالیرەدا دوو کەس هەن کاریان بۆ هەمووتان کردو ئێوەش چیتان لە سەربووو توانیتان کردتان بۆ ئەوەی ئەم رۆژە بکەنە بەختیارترین رۆژی ژیانیان ئەمەش بوو کەدەبێ بیکەن، چونکە کاریان بۆتان کردووەو کاریش لە دراوی مس و زیوو گەورەترە. کار هەمووکاتێ لەو خەلاتە گەورەترە کەلە سەری وەری دەگری! چونکە دراو دەروات، بەلام کارەکە دەمێنێتەوە.. ئەم دووکە سەش دلخۆش و زیندوون. ژیانیان ناخۆش بوو، کەچی گازندەیان نەکرد. لە وانەبوو کە ژیانیان لەوە زۆر ناخۆشتریش بێ کەچی لەگەل ئەوەشدا بێزار نەبوون. ئێوەلە کاتی پێویستیاندا یارمەتیان دەدەن. هەر یەکەیان دوو دەستی پاك و دوو دلی ئازایان هەیە.»

«زۆر شتی وت کە بریتی‌بوون لە ستایشی من و ئیداو هەموو کۆبوو‌بووەکان!»

پیاوە پیرە کوێرەکە بە تاکە چاوەکەی سەرنجی هەمووماني داو گەرایەوو تافی لاوی یە لە دەست چووەکەی‌و وتی:
«گەورەکانم، ئاوا بە کورتی شتێکی خەلکیم بۆگێرانەوە.. باسێکی خۆشی‌بوو... جاوانیە؟»

چیرۆکێکی فولکلۆری کوردی

# پێویستە پێکنیمان بجرێن

هێرش محمد أمین

کابرایە دەبێت زۆر دەوڵەمەندو دەستەڵات دار دەبێت، بەهۆی پارەو دەستەڵاتیەوە کردەوەی وای دەنواند لەبیرو عەقڵی هیچ کەسێك دا نەبوو. . . کەسیش نەیدەتوانی پێ‌ی بڵێت بەری چاوت کلی پێوەیەو هەرچی دەوت بۆی دەچووە سەر

رۆژێکیان جارچی ناوبازاڕی شارەکەیان بانگ دەکات و پێ‌ی دەڵێت جارێك بدەو بڵێ کابرایەك هەیە ناوی قەیتول ئاغایە گایەکی هەیە هەرکەس بتوانێ فێری خوێندنەوەو نووسینی بکات خەڵاتێکی باشی دەداتێ.

هەواڵ بڵاوبوویەوە بەناو شارداو خەڵکی کەوتنە مقۆمقۆو سەریان لە داواکارییەکەی قەیتول ئاغا سوڕما.

هەر لەم شارەدا پیاوێکی هەژاروکەم دەست هەبوو خێزانێکی گەورەشی کەوتبوو بەسەرداو بەسکێ تێربوون بە دەست برسی. . . کابرا لێکی دایەوەو وتی: بۆئەم کارە نەگرمە ئەستۆ لەمە ئاسان تر نی‌یە بەلکو بەهۆیەوە لەم هەژاری‌و چەرمەسەری‌یە رزگارمان ببێت. . . بۆ بەیانی چووە دیوەخانی قەیتول ئاغاو داوای بینینی کرد. . خزمەت کارەکان چوونە لای ئاغاو وتیان کابرایەکی شرۆلە هاتووە دەیەوێت بەرێزتان ببینێت؟ ئەمیش وتی باشە با بێت. . کابرا هات و سڵاوی لە ئاغا کردوو بە لا لوتێکەوە وەڵامی دایەوەو وتی:

چیت ئەوێت؟

**کابرا وتی:**

- ئاغا هاتووم گاکەت فێری خوێندەواری بکەم.

ئاغا وتی: جا دەتوانی؟

- بەڵێ گەورەم دەتوانم.

ئاغا وتی: ئاخر ئەگەر نەتوانی دەتکوژم

- ئامادەم قوربان ئەگەر ئەرکەکەم بەجێ‌نەهێنا.

ئینجا ئاغا وتی: باشە برۆو ماوەی ساڵێکیشت پێ‌دەدەم.

- بەڵام ئاغا منیش مەرجم هەیە؟

ئاغا وتی: مەرجەکەت چی‌یە؟

**- خانوویەکی باش و تەویلەیەکی رێك وپێك و باخچەیەکی گەورە لەگەڵ دابین کردنی هەموو پێداویستیەکی ژیان بۆ گاکەو خێزانەکەشم.**

ئاغا وتی: چیت دوێت بۆت ئامادەدەکەم بۆئەوەی ئەم ئەرکە راپەڕێنیت ئەگەرنا خۆت دەتزانی؟

لە ماوەی دوو سێ رۆژدا هەموو ئەوپێداویستیانەی داوای کردبوو بەفەرمانی ئاغا هەمووی بۆجێ‌بەجێ کراو ئامادەیان کردو گاکەیان دایە دەست و بەروارەکەیان لای خۆیان تۆمار کرد کە پاش ساڵێکی ترو لەم رۆژەدا گایەکی خوێندەوار پێشکەش ئاغا بکات.

کابرای هەژار کەوتە نازو نیعمەت و خۆشی‌یەوە ژن و منداڵەکانی لە ئەوپەڕی شادی‌و خۆشی کامەرانی‌دا دەژیان کە بە خەویش ئەمەیان نەدیبوو.

ماوەیەکی بەسەرچوو ئاغا ئارامی لەبەربڕابوو نەیدەزانی چۆن هەواڵی ئەم کابرایە بزانێت و ئاگاداربێت چۆن گاکە رادەهێنێت، بۆئەم مەبەستە یەکێکی نارد کە رۆژ بەرۆژ چاودێری کابرا بکات و بزانێت چی دەکات، کابرای چاودێری‌کەر پاش چەند رۆژێك هاتەوە لای ئاغاو پێ‌ی وت

گەورەم ئەو کابرایە نە قەڵەم و نە کاغەزو نە هیچ شتێك بەکاردەهێنێت تەنها ڕۆژی دووسێ جار دەچرپێنێت بە گوێی گاکەداو هیچی تر.

ئاغا ماوەیەکی تر هەر بەم شێوەیە دەمێنێتەوەو هەرچۆن دەبێت ئارام دەگرێت لە کۆتایی مانگی دوانزەدا ئاغا بە خۆیو خزمەتکارو دەست و پێوەندەیەوە دەچنە سەر کابرا تاوەکو بزانن گاکەی فێری خوێندەواری کردووە یان نا ئەگەر نا هەر لەوێدا سەری لە ملی بکاتەوە، کە دەگەنە ئەوێ دەست وپێوەندی ئاغا کابرا بانگ دەکەن وڕاپێچی دەکەنە بەردەم ئاغا. ئاغا هاواری دەکات بەسەریاو دەڵێت:

- ها کابرا چیت کرد.

کابرا دەڵێت: ئاغا ئێمە بڕیارمان ساڵێك نی یە، ئاغا دەڵێت: نا، بەڵام جیاوازی چییە هەر ئیمڕۆی ماوە تۆ بڵێی لە ماوەی ١١ مانگو ڕۆژدا هیچت نەکردبێت بە تەما بیت بەم یەك ڕۆژە شتێك بکەیت بە شتێك.

کابرا پێی دەڵێت: ئاغا من هیچ وەلامێکت نادەمەوە چونکە ئێمە وا بڕیارمان داوەو ساڵەکەش هێشتا ڕۆژێکی ماوە.. ئەگەر قایلیش نابیت فەرموون دەچینە لای قازی با ئەو دادمان بپرسێت.

ئاغا ناچار بوو لەبەر ئەوەی گفتی ساڵەکەی داوە نەیتوانی هیچ بڵێت بەڵام وتی با بڕۆین بۆ لای قازی.

کاتێ گەیشتنە لای قازی کابرای هەژار حاڵ و مەسەلەی بۆ قازی ڕوون کردەوە قازیش وتی مافی خۆتەو ئاغا ناتوانێ هیچت لەگەڵ دا بکات، ئەگەر ساڵەکە تەواو بوو مافی خۆیەتی ئەگەر بەڵێنەکەت بەجێ نەهێنا چیت لێ بکات وەك بەڵێنتان داوە بە یەك.

ئاغاش دەڵێت جەنابی قازی من دەزانم ئەم کابرایە هیچی بۆ نەکردووم چونکە دەڵێن تەنها ڕۆژی دووسێ جار دەچرپێنێت بە گوێی گاکەداو هیچی تر.

قازیش دەڵێت: ئاغا مادام ساڵەکە تەواو نەبووە ناتوانین هیچ فەرمانێك دەربکەین.

ئاغاو کابرای هەژار لای قازی هاتنە دەرەوەو ئاغا سەری سوڕما بوو نەیدەزانی بڵێ چی باوەڕی تەواویشی هەبوو کە ئەم کابرایە هیچی بۆ نەکردووەو تازە بەم یەك ڕۆژەش هیچی بۆ ناکرێت.

بۆیە کابرای بانگ کردە دیوەخانەکەیو پێی وت من لێت خۆش ئەبم گاکە فێری خوێندەواری بووبێت یان نا بەڵام دەمەوێت بزانم و تۆ هەموو ڕۆژێ چیت بە گوێی گاکەدا دەچرپاند؟

کابرای هەژاریش وتی: ئاغا گفتم دەدەیتێ کە توڕە نابیت و هیچم لێ ناکەیت؟

ئاغا وتی: گفتی پیاوانەت دەدەمێ

کابرای هەژاریش دەڵێ: ئاغا من ئەم کارەم لەتاو هەژاریو کەم دەستیدا کرد وتم ئەگەر سەریشم تیا چووە با منداڵەکانم ساڵێك بە خۆشی ڕاببوێرن، بۆ مەسەلەی دووسێ چرپەکەش هەموو جار بە گوێی گاکەدا دەم چرپاند پێویستە یەکێکمان بمرین یان من یان ئاغا.

چونکە بە مردنی یەکێکمان بەڵێنەکە پوچەڵ دەبوویەوە ئەگینا جەنابی ئاغا ئەگەر سەرلێ شێواوی خۆت نەبێت بەهۆی پارەو دەستەلاتەوە کەس هەیە بتوانێ گا بکاتە خوێندەوار.

ئاغا لە شەرمەزاری خۆیو ئەو گفتەی کە دابووی بە کابرا هیچی لێ نەکات، لێی خۆشی بووو ئەو پێداویستیانەی دابوویە پێی بەخشیو خەلاتێکی باشیشی کرد.

تێبینی:

ئەم چیرۆکەم لە پیاوێکی کوێری تەمەن ٦٠ ساڵەوە وەرگرت لە هەڵەبجە ناوی أمین عبدالله بەگ بوو ناسراو بوو (ئەمینە کوێر) لە ساڵی ١٩٨٣ دا هەر لە هەڵەبجە کۆچی دوایی کرد خوا لێی خۆش بێت.

# خەونی مرۆڤێکی ئەوسەردەمە

ڕووداوی ئەم چیرۆکە دەگەڕێتەوە بۆ سالآنی پەنجاکان.

● جەمال سابیر قازی ●

ئێوەش وەکو من جارجارە شاپەڕی باڵی کونندە بەبووی ئەم ژیانە جەنجاڵە خەتی شرینی (بەخت) تان دەشێوێنێ. . . ؟!

جارجارە لێوی تەڕی هیواتان وشك دادەگەڕێنێت و ئارەزووی ماچی ئاواتە سەوزەکانتان کەم دەکاتەوە. . ؟!

ئێوەش کە نەهەنگە چاوچنۆکەکان دەمی هەڵلوشین بۆ گێتی‌تان دەکاتەوەو دەریای هێمنی ژیانتان هەراسان دەکات. . وەکو من دەکەونە پرسیارکردن. . . ؟!

ئیتر من چیم. . ؟ نرخم چی‌یە؟ بۆچی بووم و دەژیم. . ؟ بۆچی دەحرم؟. . . ئەی‌بۆ نا. . ؟!. . .

ئەی چەندین جار ئەم پرسیارانەمان لەیەکتری نەکردووە؟ هەتا ئەمڕۆ هەناسەی زۆر دەمی زیندوو وەلآم دەرەوەی ئەم پرسیارانە چارۆکەی کەشتی ژیانمانی هێناوەتە شەکانەوەو شڵپە شڵپی تێکەڵ بە شڵپ وهوری شەپۆلە زەبەلاحەکانی دەریای ژیان کردووە. . !! هەتا ئەمڕۆ فرەی باڵی زۆر سوێسکەی کوێستانەکانی ئاواتمان ڕاوچی‌یەکانی ڕاچڵەکاندووەو دڵی زۆر وورچی فرێنەری کچە نەشمیلەکانی داخورپاندووە. . ئەی بۆچی هیچ کام هەناسەو وەلآمی دەمە زیندووەکان و سوێسکە هەڵفڕیوەکان. . هەنگی شەیدای ئەم کەللە سەرەمی هێوری سەرگوڵی ئاوات و خواستەکانم نەکردەوە؟!!

«بۆیە ئێستاش هەنگوین و شیرینی سوران و شادیم نۆش کردنی ئاوی کوژاڵکەو بەرە خەڕنووکەکانە. . !!»

تووێشووی سەفەرێکی تری پرژان و سەختی ئەم گۆی زەمینە بێ‌ئۆقرەو شێتگیرەم هەڵگرت و بڕیارم دا ئەمجارەیان لە مردووەکانەوە دەست پێبکەم. . لە وێستگەی ئێسك و پروسکە دێرینەکان دا گەمژەیی و دۆش دامانی سەر دووڕیانی ڕێگەی ژیان بتوێنمەوە ناو هەنگاوی باوەڕ و دڵنیایی خۆ گەڵێ جار دایکم پێی گووتووم:

ـ مردوو تەنها ئەوەندە مردووەو ئاگای لەخۆ نی‌یە هەتا دەنێژرێت. . ئەگینا گۆیی لە تەڵقین و سەڵاو خوا حافیزی نێژەرانی خۆی هەیە. . تەنانەت دەیەوێ لەگەڵ خەڵکی سەر قەبراندا بگەڕێتەوە، بەڵام لووتی لە بەردی (ئەلحەد) دەدات و پەشیمان دەبێتەوە.

«تۆ بڵێی ئەمانیش وەکو وەلآمی دەمە زیندووەکان پەی بە ڕێگای زین و ئاسمانی بۆ یەك بوونی مەمی بۆ دابین نەکات».

کە میوانەکانم بە ڕێ‌خست. . درەنگە داهاتبوو، ترس و تاریکی ببوونە نەرە دێوێك و مێشکی لەنێو چرنوك گرتبووم و نەمدەزانی چۆن وەکو میلی کاتژمێرە هەڵواسراوە کە لەم ژمارەیەوە بیانگوێزمەوە بۆ ژمارەیەکی تری دیوی ئارام. . خەیاڵی مردوو گۆڕستان بووبوو بە قووچەکێکی سام و خۆی لە دەروونمدا زەق کردبووەوە. ئەی پرسیارەکان؟!. . . خۆ پرسیارەکان لەگەڵ بیرکەوتنەوەی هەر زیندووو مردوویەکدا وەکو نەرمە جوولەی دوو پشکێك ختووکەو موچڕکیان بە لەشدا دەهێنام و چاویان پێ دەچووقاندم.

* * *

دەمێك بوو سەرم خستبووە سەر سەرین، هێشتا سووسەی خەیاڵم بەدەم گەردە لوولێکی ئەم گەرمیانەوە گێژەنگی بوو!. . کاس بووم

لەناو گۆڕستانێکی گەورەدا خۆم بینی‌یەوە، گۆڕستانەکە لە شارەکەمان بچوکتر بوو، بەڵام قەرەباڵغ تر.

وەکو دەڵێن: (هەر مرۆڤێك ئەستێرەیەکی هەیە)

کەوتمە ژماردنی ئەستێرەکان. لە ژمارە بەدەر بوون تەنانەت زۆریش هەیە هەناسە دەدات، دەجوولێت، بەڵام ئەستێرەکانیان سەرباری ژمارەی ئەستێرەی مردووەکان بوو ڕاستە دەڵێن (مردوو لە زیندوو زۆرترە)

لە ئاسمانی گۆڕستانەکەدا ئەستێرەیەکی کزم بەدی کرد، ناوی زۆر هەژارو لاوازم بەیادا هات، خۆشم نازانم چۆن ناوی نەتەوە یەکگرتووەکانم لەگەڵیاندا بیرهاتەوە:

- ئەم ئەستێرە، یاهی ڕەزالاتە.. یاهی نەتەوە یەکگرتووەکانە!! لەبواری تاریکی گۆرستانەکەو ئەستێرە کزو گەشەکانی ئەو ئاسمانە بەتاڵەدا.. دارێکی قەد ئەستووری گەڵا سەوزو چڕی گەش، سەرنجی ڕاکێشام، لق وپۆپی بە بۆشایی ئاسمانی گۆرستانەکەدا هاوێشتبوو، بوو بە بیانوویەك و بەنیوان گۆڕەکاندا هەنگاوی پێ‌هاوێشتم هەتا لە پەنایدا لەنگەرم گرت.

«زۆربەی گۆڕەکان سەرەو خوار بیوونەوە! جێ مت بوونی مردووەکان وەکو سندوقێکی ڕێك و ئەندازەیی سەر ڕووی زەوی‌و تۆپەڵە خاکی سەر گۆڕەکان بە زەویدا ڕۆچووبوون!!»

بەڵام گۆڕی بن دارەکە لەم گۆڕانە نەدەچوو، هەر لە ژوورێکی ژێر زەمین دەچوو، بە دەروازەیەکی بێ‌دەرگا، دەگەیشتە ئاسمانە بەربلاوەکەی دەرەوە.

«گەلێ‌جار گۆڕی لەو جۆرەم بیستبوو، کە لە (نەجەف) کەسانی وا هەن، ژوورێکی وا دەکرن و دەیکەن بە گۆرستانی خێزانەکەی خۆیان.. بەڵام ئەم گۆڕە لە (نەجەف) یش نەبوو...!»

خێزانی مردووەکەم یادکەوتەوەو بەهیوای‌بیبینم‌یەکێکیان بەزەقی تەماشای دەروازەکەم کردوو بانگێکم کرد، دەنگە نەبوو. هەندەی پێ‌نەچوو ناوەنــج و دەروازەی ژوورەکە بە تریفەی تیشکێکی تەنك

کەمێك ڕۆشن بووەوەو زەمینەی ژوورەکەم بەدی کرد. هەتا دەهات تریفەکە دەبوو بە ڕووناکی‌یەکی تێرو دەروازەکەی ڕووناکتر دەکردەوە، موچرك و تەزوویەکی سام بە لەشمدا هات و چەند هەنگاوێك پاشەوپاش گەڕامەوە.. تووکی لەشم ڕەپ وەستان. لەناکاو تیشکێکی زەردی تێر دەروازەو پلیکانەکانی ژوورەکەی ئاشکرا کردو شەوە زەنگی ئەو ناوەی وەکو گڕە بە تاوەکەی نەوروز دڕاندو کابرایەکی ٥٠ - ٦٠ ساڵانە هاتەدەرەوە.

دەتگووت چرایەکی بەدەستەوەیە، سەر تاپا سپی پۆش.. جوان و ڕووگەش.. تەماشایەکی دارەکەی کردو چاوێکی بە دەوروپشتی‌دا گێرا.. سەرنجی لە من گیربوو.. دەستێکی تیشکی دەدا هەروەکو شەبەنگی تیشکێکی ناویار بەری بکەوێت و بیشکێنێتەوە بە دەوروپشتدا. بەرەو من هات، لەجێی خۆم گیربووم، وەکو چەقی خولانەوەی ئەم گۆی زەمینە بم، ئاوا چەقیم. لەگەڵ هاوێشتنی هەر هەنگاوێکی‌دا هەستم دەکرد موچرك و تەزووی ئازاڕو ترس ناخم دەقرچێنێت.. هەناوم تەواو گەرم داهات.. پێستی لەشم ساردو سڕو هەناسەم گەرم بوو هەر وەختبوو مەلاشووم بسوتێنێ.. لەشم کەوتبووە لەرزینێکی لەڕادە بەدەر.. هەروەکو سیبەرۆم گرتبێ یان ئەندامێکی ئێسك شکاوبم.. ساردو لەرزۆك.. هەستم بە قەبارەی کرۆکی تووکەکانی هەموو جەستەم دەکرد.. هەتا لە پێشمدا لەنگەری گرت: - ها.. کاکی برا.. بانگت کرد! خێرە بەم شەوە لەم گۆرستانەدای؟! قسەم بۆ نەهات..

دەمم بیوو بە تەڵەی تەقیوو چووبوو بەگیرا.. جل وبەرگە سەرتاپا سپی‌یەکەی سامێکی گەورەبوو.. وەکو کۆتێکی قورس کەوتبووە ملی ئەسپی ئازایەتی دڵم.

خۆمم زۆر لەو بچوکتر هاتە پێش چاو.. هەستی بە ترسەکەم کردو دەستی ڕاستی بۆ درێژکردم، بەر سنگی تەواو ڕۆشن کردمەوە.. مەچەك و لەپی ڕاستی زێڕێکی بێ‌گەرد بوو.

بەدەم زەردەیەکەوە ووتی:

- کاکی برا.. ئێمەی مرۆڤ کەسی یەکترین هەموو بەری پیاوو ژنێکین.. گەر لە یەکتری بگەڕێین دوور نی‌یە باپیرەت بم. کەمێك ترسەکەم ڕەوی‌یەوە، قفڵی دەمم کرایەوەو شنەیەکی وورە هات بە دەروونمداو وەکو نەخۆشی‌یەکی سیارەت کردوو پرسیارەکانم هاتەوە یاد.. ئارەزووی دواندنی بە دەمارەکانی لەشمدا تەنی‌یەوە.

«تۆ بڵێی لە بری فاتحەو سەلاوی سەرگۆر ئەم پرسیارانەی لێ‌بکەم وەڵامم نەداتەوە...؟!»

- کاکی برا.. بۆ وا مات بووی؟

- ها؟ ئە... هیچ نی‌یە!

- وادیارە شتێکت پێ‌یە!

- کاکی لەپ زێڕین، کەس وکات لە کوێن؟! لەگەڵتا نین؟!

بەدەم ئاهێکی قووڵەوە، ووتی:

- بەڵێ دایك و کوڕێکم لێ بەجێ ماوە... زۆر پەرێشانم بۆیان.

ئەی چۆن مردی؟!

- من نامەوێ زۆربڵێ بم.. دان بە خۆتا بگرە، ماوەیەکی کەمی ماوە ئاخر زەمان بێت و هەر پێغەمبەرەو پێش نەتەوەی خۆی دەکەوێ‌و لەو (بانە)دا دادگای خوا دادەنرێت ورووبەرووی دەبینەوە.. جا ئەوجا هەموو شتێك بە چاوی خۆت دەبینیت. بێ‌تاوانی منیشت بۆ ساخ دەبێتەوەو منیش بە دایك و کوڕی خۆم شاددەبمەوە.

- کاکی لەپ زێڕین، ئەم ماوەیە جۆن دانت بە خۆتدا گرتوە لەم گۆڕەدا؟!

- من هیچ نەبێ ئەم دارەم پێگەیاند.. تەنانەت لە زۆر زیندوی (متقاعد)یش باشترم کە تەنها چاوەڕوانی سەرمانگە و موچەو نەمانن.. بەڵام من، لەگەل شین بوونی هەر گەڵایەکدا شین دەبمەوە. لەگەل تەقینی چرۆی هەر لقێکدا دەتەقمەوەو لە دایك دەبمەوە.

* * *

هێشتا قسەکانی تەواو نەکردبوو لەلای ژوورمانەوە باوبارانێکی بەلیزمەو شەستە تێ‌ی‌کرد.. زریانێکی توورە هەڵی‌کردو بەرەو ئێمە هات.. لای ژوورمانی شێواند.. داروبەردو گۆڕەکانی تێکەڵ وپێکەڵ کرد.. هیچ شتێکی لە جێگای خۆیدا نەهێلا.. تەیرە ئەبابیلاش هەموو شتێکی بە شەیتان دەزانی‌و بەردە بارانی دەکرد.. مرۆڤ لەو سات و شوێنە دەتوقی.

بەڵام لەپ زێڕین نەدەترسا. جوان جوان پێ‌دەکەنی‌و بزە

دەیگرت . . هەستی دەکرد وا خێزانەکەی لەپشتی ئەو زریانەوەن و بەرەو ئەم دین .

زریانەکەمان پێگەیشت . . رایماڵین . . هەر جارە ناجارێك بانگێکی لێدەکردم :

- کاکی برا . . قاچت گیر بکە لە زەوی ، دان بە خۆتا بگرە ، ئەمە رێگای کردنەوەی کلۆمی نهێنییەکانە .

کەزریانەکە برایەوە . . کەل وپەلمان لەبەردا نەمابوو رووت و قووت لێی مابووینەوە . . هەموو نهێنیو کۆنە دوومەڵ و جێزامەکانمان لە یەك ئاشکرا بوو .
تەنها لەپێکی زێر بوو . . جێ خەنجەرێکی قووڵ بە پشتییەوە دیاربوو . . ناسیمەوە !
«هەر زەردەی دەهاتێ» .

هێمنیو بێدەنگی بواری چەند بانگەوازێکی دا بگات بە گوێمان . . هەر برەو لە گۆڕەکانەوە هەستان و بەرەو یەکێك لە بانگەوازەکان چوون . .
پۆل پۆل لە (بانە)کەدا وەستان . لەهیچ یەکێك لە بانگەوازەکان نەگەیشتین . . لێرەو لەوێ تاك وتەرا کەسانی تر مابوونەوە ئێمە ئاساو لەگەل ژمارەیەك کەرویشك وکەرو پڵنگ و ئاژەڵی تردا .
سەری سوڕما ! چاوم لێبوو . . کەمێك شڵەژاو دەم و چاوی وێك هاتەوە
- هەی ؟ ! ئەی بۆ بانگی ئێمە نەکرا ؟ !

لەم کاتەدا چەند کەساتێك لە کۆمەڵەکان بەرەو گۆڕەکان و ئێمە گەڕانەوە .

یەك دوانێك ئاژەڵەکانی کۆکردەوەو بەرەو بانەکەی بردن ؟ یەك دوانێکی تریش بەرمو ئێمە هات و کۆیان کردینەوە . بزەی هاتەوە سەر لێوو ووتی :

- چۆن پێغەمبەران ئێمە لە یاد دەکەن . . ؟ وا دەمان بەن بۆ (بانە)کە هەر جارە ناجارێك بە ئەسپاییەکەوە پێی دەگووتم :

- ئێستا هەموو شتی بە چاوی خۆت دەبینی .
ومنیش لێوی چاوەڕوانیم بۆ دەخەناند .
یەکێك لە پێغەمبەرەکان ناوێکی بانگە دەکردیان ئاماژەیەکی بۆ نیشانە بە دەستێك دەکرد :

- ئەتۆ وەرە

ڕووتەی لە پزیڕینی ئاوەڵم ڕادەچڵەکیو ڕاستە پێهەڵدەسایە سەرپێو دەیووت :

- من گەورەم ؟ !

- نا . . نا . . ئەوی پێشت
سارد دەبووەوەو بە ماتیو ڕووتییەکەی خۆیەوە لە تەنیشتم دادەنیشتەوە .
- ئەتۆ بابە .

دیسان هەڵدەستایەوە
- من ؟ روحم بە قوربانت بێت !
- نا . . نا ئەوی پاشت .
هەتا هەردوو ماینەوە . . ڕووت وڕجاڵ . . ئەوگوێیهەڵخستبوو بۆ هەناسەکانی من و منیش چاوەڕوانی شتێك بووم بڵێت . چاوم لێبوو . .
دیسان دەم وچاوی وێك هاتەوەو زەرد هەڵگەڕا . . لێوەکانی وەکو دوو قەیتانی سپی دەم ڕەشەبا لەسەر یەك نەدەنیشتنەوەو لە هەڵتەکین دا بوون . . لە هەموو شتێك پەشیمان بووەوە . . گوێم لە بۆڵە بۆڵەکەی بوو لەژێر لێوە سپی هەڵگەڕاوەکانییەوە .
چاوەڕوانیو ئاواتەکانی بوون بە ئەسکڵێکی گەش و هەناوی هەڵقرچاند . . یوکروزی قرچەقرچو سووتان تەنها بە لووتی مندا هات .
فرمێسکی بەزەیی بەر بینایی چاوەکانی گرتم و لێڵی کرد پشتم لێکرد . .
لە یەکەم سەرنج دانی پشتمەوە . . شانی بەرەو دوا ڕاکێشام و ووتی :
- تەماشا ڕۆڵەکەم ! . . .

* * *

که ئاوڕم دایەوە . . بە ڕوویەکی خەندەوە بە پەنجە ئیشارەتی بۆ دارە سەوزە ئەستوورەکە کردبوو .
«ڕوپ وڕاست وەستابوو . . وەکو جاران نەژاکاوو قیت . . زریان و ئاخرزەمان تەنانەت قەدیشی نەهەژاندبوو لە زەمیندا ! ! گۆڕەکەش پڕ بووەوە» .

پارچەیەکی سووری بۆ درێژکردم . . بە خەتێکی سپی لەسەری نووسرابوو . . لەبەر تیشکی لەپە زێرینەکەیو بریقانەوەی فرمێسکە قەتیس ماوەکەی چاوم بۆم نەخوێندرایەوەو ووتی :
- ئارۆڵە فرمێسکەکەت بسڕە . . مەگری ! !

«هەر زەردەی دەهاتێ»

* * *

که لە خەو ڕابووم . . ڕووت و قووت .
پارچە سوورەکەم بە دەستەوە بوو . . دایکم لەبەر تلانەوەی دەم خەوم دەمێك بوو لەخەو هەڵسابوو . . یەسەرمەوە چاوەڕێی هەڵسانم بوو . .

- گووتم - دایە ئیتر ناڵێم بابم چۆن بوو ! ! !

که پارچە سوورەکەم خوێندەوە . . لێی نووسرابوو
«ئیتر خۆم پێغەمبەری خۆم و خێزانەکەمم»
منیش گوتم :

- گەر وانەبێ بە دڵ خواستی مردن ئەکەم
دایکم گوشیمی بە خۆیەوە . . هەڵیمژیم . . ئەوماچەیەکەم ماچێکی گەرم بوو کە دایکم کردبێتمی .

# ڕەخنەی ژمارەی تایبەتی چیرۆک

● زاهیر ڕۆژبەیانی ●

- ١ -

(سەلام مەنمی)چیرۆك نووسێکی ناسراو و هەمیشە ئامادەو بەردەوامە . شارەزایی‌یەکی سەرەنج ڕاکێشیشی هەیە لە زمانی میللی و ژیانی کوردەواری‌دا، لە زۆربەی بەرهەمەکانیشی‌دا سوودی لەم شارەزایی‌یە دیوە و کردویەتی‌یە سیفەتێکی تایبەتی بۆ خۆی‌و کارەکانی بۆیە هەندێ کەسیش وەك دەقی فۆلکلۆری‌و میللی تەماشای بەرهەمەکانی دەکەن . وەلێ ئەم لە بەرهەمەکانی ئەم دوایی‌یەدا هەولێ داوە خۆی لە زمانە ئاسایی‌یەکە لا بدات و زمانێکی ئەدەبی بەکار بەرێت، بەلام بۆ بابەت هێشتا هەر پابەندی ژیانی لادێ‌و کۆمەڵگای کوردەواری سادەو ساکاری گوندە . پاڵەوانەکانیشی تا ئێستا هەر لەو ژینگەیەوە سەر دەردێنن و لە ئاکامیش دا ڕوو لەوێندەری دەکەنەوە .

کەسی سەرەکی ئەم چیرۆکی (سەرچاوە)ی کە لە ژمارە تایبەتی‌یەکەی گۆڤاری (بەیان) دا بڵاوکراوەتە نموونەیەکی چاکی ئەم بۆچوونەمانە. (سیامەند)ی پاڵەوانی ئەم چیرۆکە، کەسێکی بە بنەچە گوندی‌یەو، لە بارودۆخێکی ناهەمواردا ناچار دەبێت رووەو شار رەو بکات و، لەوێ بۆخۆی ژیانێکی تایبەتی دەس پێ بکاتەوە، سەرەتا هەوڵ دەدات بچێتە بەرگی شارنشینانەوەو، خۆی لەگەڵ ژیانی شاردا بسازێنێت: (هەرچۆنێ بوو، دوکانێکی بچووکی سێ‌گۆشەیی لە سووچێکی شاردا دەسکەوت و چەند قاڵب سابوون و دوو سێ دەستە شقارتە و سندوقێ چا و چەند شتی وردەی تری تیا دانا...) وەلێ ئەوەندە حەسرەت بە دیاری ژیانی رابوردووەو، ئەوەندەش هەست بە نامۆیی شوێن و کارەکەی دەکات تا سەرئەنجام لەگەڵ بار و دۆخە کتوپڕە نوێ‌یەکەدا ناسازێت و هەر زوو لێی بێزار دەبێت: (بەڵام ئەوەندە وەڕس و بێزار بوو هەتا کیلۆیەکی ئەفرۆشت سەد ناشکوری ئەکردو ئەکەوتە گلەیی‌و ئەی‌وت.

(ئەمەبێ من و ئەمەیان وتووە..؟! بۆ باوکم ترێی فرۆشتبوو هەتا خۆم تەماتە بفرۆشم!!)...

جیاوازی نێوان مرۆڤی شارنشینی هەڵپەکەر و، مرۆڤی گوندنشینی دەس و دڵ فراوان لەم رستەیەی دوایی‌دا بە روونی دەردەکەوێت ئەو باوکیشی بەروبووی باخ و رەزی نەفرۆشتووە و چاوی لە شوێنی نەبووە. ئەڵبەتە خۆیشی ئێستا بەم دەست ودەمە فێری ئەوە نابێت دەست بۆ پارەی کیلۆیەك تەماتە لە خەڵك پان بکاتەوە. ئەمە سروشتی تایبەتی گوندیانەو، هەرگیز بە برپارێکی دەرەکی کتوپڕ ئەم دیو و ئەو دیو نابێتەوە. بۆیە سیامەندیش هەرچەندە سەرەتا مل بۆ دۆخە نوێ‌یەکە دەخەوێنێت و‌دەرهەق دەم دوکانێکی لێ دادەنێت و هەوڵ دەدات خۆی رابێنێت، بەڵام دوایی دەرنابات و ناتوانێت بیباتە سەرو، لە ژیانە نوێ‌یەکەی و کارەکەشی دوردونگە دەوەستێتەوە و رەتی‌دەکاتەوەو هەنگاوی یەکەمی کۆچی پێچەوانە دەهاوێت.

(..برپاری‌دا لەمەولا چەند باوکی ترێی فرۆشتبوو، ئەمیش ئەوەندە تەماتە بفرۆشێ...)

دۆزینەوەی ئەم جیاوازی‌یە گرنگەی نێوان سروشتی خەڵکی گوندو سروشتی خەڵکی شارەو پەی‌بردن بەم جۆرە حاڵەتە دەروونی‌یە وردانەو، بە کاربردنی لە چیرۆکی (سەرچاوە)دا هەمووی لە شارەزایی‌و وردبینی چیرۆك نووسەکەوە سەرچاوە دەگرێت و بابەتەکە پێك دێنێت وەلێ بابەت بەتەنها نابێتە هۆی بەرهەم هێنانی دەقێکی ئەدەبی هونەریی ئەگەر لە شێوازێکی هونەریی کاریگەر و سەرنج راکێش دا دەرنەبرێت و بەرجەستە نەکرێت.

سەلام لە گێڕانەوەی ئەم چیرۆکەدا شێوازێکی تا رادەیەك بە گرێ و گۆڵی بەکار بردووە. ئەوەشی لەبەرئەوە کردوە تا راستەوخۆ باسی هۆو چۆنێتی رەوکردنەکەی سیامەند نەکات، بەڵکو بە پێچ و دەورە دەیگێڕێتەوە و لە بری راستەوخۆیی پەنا دەباتە بەر دیمەنێکی هاوچەشنی رابوردووی مێژوویی و لە دوورخستەوە و گەڕانەوەی شێخ مەحموودی ئەمردا دەیخاتەوە بەر چاو.

لە سەرەتای چیرۆکەکەدا چیرۆك بێژێکی بێ لایەنی فرە ئاگاه چیرۆکەکە بە چەند رستەیەکی خەبەری دەکاتەوە و لە رووداوەکانی پێش دەست پێ‌کردنی بەسەرهاتەکە ئاگادارمان دەکاتەوە و چوارچێوەی گشتی‌و شوێن و کاروباری ئێستای ژیانی رۆژانەی پاڵەوانی چیرۆکەکەمان بۆ دەسنیشان دەکات. دواتریش لە دیوی دەرەوەوە دەگوێزێتەوەو، ئینجا بە ناخی پاڵەوانەکەدا شۆڕ دەبێتەوەو باری دەروونی ئاڵۆز و پڕ نیگەرانی‌و بێزاری پاڵەوانەکەمان بۆ یەکالا دەکاتەوە. ئنجا لە ساتەوەختێکی تایبەتی‌دا لەنگەر دەگرێت و رۆشنایی دەخاتە سەر پاڵەوانەکە لە ـ کات ـ ێکی دیاری‌کراودا لەسەری دەوەستێت (..بەهەر فەلاکەتێك بوو دوو کیلۆ تەماتەی فرۆشت و پشتی بە دوکانەکەیەوەداو...)

دوای ئەوەش رێگا بۆ پاڵەوانەکە خۆش دەکات بە رابوردووی خۆی‌دا بگەڕێتەوە و دیمەنێکی ژیان پێشووی خۆیمان بە فلاش باك بگێڕێتەوە.

(لە گۆمی خەیاڵێکی قوولا ون بوو.. بیری وەك باڵندە فڕی‌و لەسەر بەردە نوێژەکانی سەرچاوەی (داریکەلی) نیشتەوەو وتی:)

لەمەبەدوا چیرۆك بێژە بێ‌لایەنە فرە ئاگاکە خۆی دەکێشێتەوەو گێڕانەوە مەوزووعی‌یەکەش کۆتایی دێت و جڵەوی گێڕانەوەکە دەکەوێتە دەست پاڵەوانەکە خۆی، ئەویش لە سەرەتای گێڕانەوەکەدا لە پێش هەموو شتێك وێنەیەکی گشتی ئەو شوێن و سەردەمەمان بۆ دەکێشێت کە بە پەرۆشەوەیە بۆی.

(ئەوجا لاو بووم، شام بە سەپان نەئەزانی دنیاش لام چاتۆڵ بوو، بەراستی‌ی زەمانێکی خۆشبوو کە نۆرە رانم ئەهات مەرەکانم بۆ ئێرە ئەهێناو تێر و پڕ ئاویان ئەخواردەوە..)

وەك دەبینین بە گۆڕانی چیرۆك بێژەکە (کات)و (شوێن)ەکەش دەگۆڕێت. دوای پێشکەش کردنی دیمەنە گشتی‌یەکەش دێتە سەر گێڕانەوەی دیمەنێکی تایبەتی کە خوی پاڵەوانی سەرەکی بووە تیایدا:

(..کە مەڕدۆش ئەهات هەر لە دوورەوە بریسکەی نقێم و کەمەرەکەی (گوڵەخان) ئەهات و ئەیدا لەناو چاوم ئەمەش نیشانەی ئەوە بوو منیش شمشاڵەکەم لە قەدم بکەمەوەو فووی پیاکەم و ئەو ناوە پڕ ئاواز بکەم، چونکە هەموو جارێ ئەی‌وت: ـ سیامەند دەنگی شمشاڵەکەت زامەکانم تیمار ئەکات و وائەزانم تازە لەدایك بووم دنیاش موڵکی منە.. کە نزیك بووە ئەت وت مانگەو خەرمانەی داوە. کە بە چاوە کووژکەیەکانی تیلیان تێ‌ئەگرتم لەشم ئەنیشتە سەر ئارەق و دەمارەکانم لە گرێژنە ئەچوون، هەتا ئەو رۆژەی دام ئەهێڵنە ناو گۆڕی تاریك تیشکی ناو ئەو نقێمەم لەبیر ناچێ. ئاخ خۆزگە ئەو نقێمە ئەخرایە ناو گۆڕەکەیشمەوە) دوای ئەم دیمەنە تایبەتی‌یەی کە پەیوەندی لەپسان نەهاتووی مرۆڤ و شوێن و، مرۆڤ و بیرەوەری‌یەکانی دەسەلمێنێت. شێوەی گێڕانەوەکەش دیسان دەگۆڕێت هەرچەندە چیرۆك بێژەکەش ناگۆڕێت بەڵام لە چیرۆك بێژێکی زاتی‌یەوە کە بەسەرهاتی خۆی دەگێڕێتەوە دەبێتە چیرۆك بێژێکی مەوزووعی لاوەکی و ئینجا بەسەرهاتێك یا راستتر بڵێین دیمەنێك دەگێڕێتەوە کە خۆی رۆڵی تێدا نی‌یە، وەلێ وەك شایەتێك چاوی پێوە بووە. بیرکەوتنەوەی گوڵە و سەرچاوەی داریکەلی ئەم دیمەنەی دەخستەوە بیر کە باس لە نریتێکی کۆنی کوردەواری دەکات و وەك من بیستومیشە رووداوەکە رووداوێکی راستەقینەشە.

(. . ئای سەرچاوە یادگارت زۆرن و لە ژماردن نایەن . . ئەی ئەو ڕۆژەی گوڵەو هاوڕێکانی کوڵی مەرەزەیان ئەکێشاو شێخ محمودکانەمریش لەگەڵ سوارەکانیا هاتن و ئاویان خواردەوە . . . لە ناکاو گوڵەو هاوڕێکانی گوریسیان نێو قەدی‌و وتیان :

ـ هەتا پەیمانی سەروکراسمان نەدەیتێ بەرت نادەین . . ئەویش بە زەردەخەنەیەکی پڕ لە خۆشی‌و پاکێتی‌یەوە پەیمانی دانێ‌و ڕووی کردە گوڵەو وتی :

ـ گوڵە خان هەقی ئەم پیلانە لە باوکت ئەکەمەوە . .

ـ من کراسی خۆم مسوگەر کرد ،

ـ پیرۆزتان بێ . .

لێرە بە دوایشەوە کە شێخی نەمر وەك کەسێکی نوێ دێتە نێو دەقەکەوە ، هەمدیس شێوازی گێڕانەوەکە دەگۆڕێت و لە گێڕانەوەی مەوزووعی‌یەوە دەبێتە گێڕانەوەی زاتی . چیرۆك بێژەکەش دەگۆڕێت پاڵەوانی سەرەکی چیرۆکەکە دەکشێتەوە و شێخی نەمر دەکەوێتە گێڕانەوەی بەسەرهاتێك کە خۆی پاڵەوانی سەرەکی‌یەتی بەپێی ئەوەش ڕاناوەکە دەبێتە ڕاناوی کەسی یەکەمی تاك (من) کات و شوێنیش دیسان دەگۆڕێن ، کات دەبێتە سەردەمی دوورخستنەوەی شێخ و ، شوێنیش دەبێتە هندوستان . قسەکانی شێخیش هەندێ جار ـ لە سەرەتاوە ـ دەبنە مەنەلوگی ناو مەنەلوگ :

(ئەوەی وت و قاچی خستە ناو ئاوەکەوەو وتی : «ئای سەرچاوە چەند خۆشەویستی (. . .)کە لە هیندستان دیل بووم زۆرم بیر ئەکردی و ئەم وت :ـ ئەبێ ڕۆژێ لە ڕۆژان سەرچاوەی داریکەلی ببینمەوە تێر تێر ئاوی لێ بخۆمەوە . . ؟)

جاری واش هەیە وەك دایالۆگێك دەردەکەوێت :

(هەندێ بێ‌دەنگ بوو ، پاشان وتی :

ـ وائەزانم ئاوی سەرچاوەی بارۆیش لەگەڵ ئەما یەك ئەگرنەوەو یەك ئاون . . )

پاڵەوانی سەرەکی چیرۆکەکە ـ سیامەند ـ پاش ئەم دایالۆگە دیسانەوە وەك چیرۆك بێژێکی مەوزووعی بۆ تەواوکردنی دیمەنەکە دێتەوە پێشێ و دەڵێ :

(هەستاو سواری ماینە ڕەش بوو . هەر قاچی خستە ناو ئاوزەنگی وەك ئاسکی بان مەقان بەخۆیا هات ( . . . . ) سوارەکانیش دوای کەوتن . . . ) .

دوای تەواوبوونی ئەم دیمەنەش گێڕانەوەکە بە وەسفێکی دڵتەزێنی ئێستای داریکەلی و سەرچاوەی داریکەلی ڕادەگرێت و دواتریش لەبەر ڕۆشنایی ئەنجامی ئەزموونەکەی شێخ دا بەخۆی‌دا دەچێتەوەو دڵخۆشی خۆی بە قسەکانی ئەو دەداتەوە ( . . تۆ بڵێی لەم دوکانە شرەدا بمرم و سەرچاوە ئاشنایەتیم لەگەڵ نەگرێتەوەو گوێم لە خورەی نەبێتەوە و تێکەڵاو بە دەنگی هەنگ و شمشاڵ نەبێتەوە . . بۆنا . . ؟( . . . ) خۆ شێخی نەمر لەگوتری ئەو قسەیە ناکات و قسەکانی نەخشی بەردن : (مرۆڤ بمێنێ بە هەموو ئاواتێکی خۆی ئەگات و هەموو تەنگ وچەڵەمە یەکێشی لەبیر ئەچێتەوە . ) لێرەدا کەسایەتی‌یەکی لاوەکی دێتە دەقەکەوەو بەدەنگی خاڵە کیلۆی تەماتە بەچەن؟ . زریزەی خەیاڵی دەقرتێنێ و دەیهێنێتەوە شوێنی خۆی . لەگەڵ ئەوەش دا چیرۆك بێژە

فرە ئاگا بی‌لایەنەکەی سەرەتاش دێتەوە پێشەوە بەم ڕستەیە (بریاری‌دا لەمەولا چەند باوکی ترێی فرۆشتبوو . ئەمیش ئەوەندە تەماتە بفرۆشێ . ) جەسەری

چیرۆکەکە دێنێتەوە یەك و کۆتایی بە ئەرکەکەی خۆیشی دێنێت .

وەك دەبینین نەخشەی گێڕانەوە چیرۆکەکە بەربڵاو و بەگری‌و گۆڵە و زۆربەی جۆرەکانی چیرۆك بێژو ، مەبەستەکانی گێڕانەوەو ، شێوازەکانی گێڕانەوەی تێدا بەکاربراوە . چیرۆکی کورت وەك کات و ، شوێن و کەسایەتی‌و ، بابەتەکەی دیاری‌یەو سنووری خۆیان هەیە ، هەر ئاوا تەکنیکی گێڕانەوەکەشی سنووری خۆی هەیەو ، دروست نی‌یە لە ئاستی پێویست دەربچێت . بەڵام ئەوەی لە شێوازی گێڕانەوەی کورتە چیرۆکی (سەرچاوە)دا بەرچاو دەکەوێت مەگەر لە ڕۆمانێکی سەر بە شێوازی شەپۆلی هۆش دا بەرچاو بکەوێت ، کەچی مامەڵەکردنی ڕەگەزی کاتەکەی مامەڵەکردنێکی پڕ بە پێستی ـ کات ـ ی کورتە چیرۆکەو لەچەند ساتێك پتر ناخایەنێت ، کاتی ڕووداوەکەشی هەرئەوەندەی کاتی گێڕانەوەکەی دەبات . چیرۆك نووس دەیتوانی سوود لەم یەکسانی‌یە ببینێت و چیرۆکەکەی بە شێوازی (گێڕانەوە دەس بەجێ) بگێڕێتەوە و ئەو بارگرانی‌یە نەخاتە ئەستۆی دەقەکە کە ئێستا بەسەریوەیەتی لەمەش بترازێت

دەقەکە گەلێك لایەنی باشەی دیکەی تێدا دەبینرێت وەك خێرایی بەدەنگەوەچوونی ڕووداوی مەزن و بەرەنگاربوونەوەی کارەساتی مێژوویی گەورەو ، ئازایی و ڕاستگۆیی دەربڕین و ، بەرجەستەکردنی خەم و پەژارەو ، ئێش و ئازاری مرۆڤی هاوچەرخ و ، لەبەرچاوگرتنی هەست و ئارەزوو و ئاواتی گشتی و تایبەتیش .

ـ ٢ ـ

ئەوەی کە بەڵگە نەویستەو ، دوودڵی هەڵ ناگرێت ئەوەیە کە لەناو چیرۆك نووسە کوردەکان دا ، عەبدوڵڵا سەراج لە هەمووان پتر پەنا دەباتە بەر ڕەگەزەکانی هونەری شێوەکاری وەك : ڕەنگ و هێڵ و بۆشایی و سێبەر و ڕووناکی و کۆڵین و تاشین و لاکێشەو بازنە و چوارگۆشەو . . هتد . لە (دەمەتەقێ) یەك دا کە لە گۆڤاری بەیان ـ ژمارە (١٢٣)ی ئەیلولی (١٩٨٦)دا بڵاوکراوەتەوە ، کە پرسیاری هۆی ئەم دیاردەیەی لێ‌دەکرێت لە وەڵام دا ئێژێ : (لەبەرئەوەیە وشە بەهانامەوە نایەت . )

وەلێ حاڵەتەکە لەکن (حسام حکیم) بەتەواوی پێچەوانە دەبێتەوە . ئەم خۆی خاوەن زەمینەیەکی ڕۆشنبیری و تیۆریی ئەکادیمیانەی هونەری شێوەکاری‌یەو ، بەکردەوەش گەلێك تاقیکردنەوەی پراکتیکی باشی هەیە لەم بوارەدا ، وەلێ لەوە دەچێت ئەمیش بە دەست کەم برشتی هونەری شێوەکاری‌یەوە گیرۆدە بووبێت و نەتوانێت هەست و سۆزی خۆی وەك پێویست پێ دەرببڕێت بۆیە لە هاوشانی چالاکی‌یە شێوەکاری‌یەکەدا ناوە ناوە چالاکی ئەدەبیش دەنوێنێت و پەنا بە بەر هونەری کورتە چیرۆك دەباو مامەڵە لەتەك هونەری وشەو ، وتن دا دەکات .

(ژێر زەمینێکی ئەفسووناوی) یەکەم چیرۆکێتی و لە گۆڤاری (نووسەری کورد)ی ژمارە (٦)ی خولی سێیەمی ساڵی (١٩٨٨)دا بڵاوکراوەتەوە . ئەم چیرۆکەی چیرۆکێکی سەرکەوتووو ، سەرنج ڕاکێش بوو . کارتێکردنی هونەری شێوەکاری پێوە دیارە .

(خەوزڕان)ی ژمارە تایبەتی‌یەکەی گۆڤاری (بەیان)ی ژمارە (١٤٨)یش دووەم چیرۆکی بڵاوکراوەیەتی . کارتێکردن و ڕەنگ دانەوەی شارەزای‌یە هونەری‌یە شێوەکاری‌یەکەی بەم چیرۆکەشەوە ئاشکرایە .

جاری لەپێش هەموو شتێك دا پاڵەوانەکەی هونەرمەندێکی شێوەکارە ، سەرنەکەوتنی لە وێنەکێشان و بەرجەستەکردنی ئەو دوو چاوە ڕەش و گەشەی کە

خۆی دەڵێ: (گەردو خۆڵ لەسەر بەهاری ژیانم لا دەبەن و کانیاوی چێژی جوانی لە ناخمدا دەشڵەقێنن.)وەکو پەپکوڵە دەچەقێت بە گوڵمی مێشکیدا و تووشی نیگەرانی و خەوزڕانی دەکات، (دوور نییە توانیبێتم نیگاری زۆر شت بکێشم، بەڵام هەروەکو دەزانی تا ئێستا نەم توانیوە نیگاری چاوەکانی تۆ بکێشم...)

پاکانە کردنی پاڵەوانە نیگار کێشەکە بۆ سەرنەکەوتنەکەی لە وێنەکێشانی چاوەکان دا لەو ڕستەیەی سەرەوەدا بەڕوونی دەردەکەوێت. ئەو توانیویتی نیگاری زۆر شتی دیکە بکێشێت بەڵام لە ئاستی (چاو)دا دەستەوەستانە چاو تەنها ئەندامی مرۆڵە کە پەیوەندی ڕاستەوخۆی بە ناخییەوە هەبێت و هەست و سۆز و هەڵوێست و بیر و بۆچوونی بە ڕاستگۆیی و بەبێ دەسکاری و پێچ و پەناو پەردە دەربڕێت و بیگەیێنێتە دیوی دەرەوەی و بیخاتە بەر هەستی خەڵکی دیکە، پاڵەوانەکە لە ئەنجامی ئەزموونی تایبەتی خۆیدا گەیشتۆتە ئەو بڕوایەی کە پەرەموو چەو ڕەنگ و هێڵیش ناتوانن ئەو هەست و سۆز و ڕاستگۆییە بەو ڕاستی و زندوویییە بەرجەستە بکەن کە چاوێك لە چاوێکی دیکەدا دەیخوێنێتەوە. بە شێوەیەکی دیکەش دەتوانین بڵێین پاڵەوانە هونەرمەندەکە سەرنەکەوتن و دەسکورتییەکە دەخاتە ئەستۆی کەم بڕشتی هونەرەکە. ئەز ئەمە بە ئەنجامێکی ڕاستەوخۆی ئەزموونە هونەرییەکەی (حسام)ی نیگارکێش، نەك چیرۆك نووس، خۆی دەزانم، ڕەنگە هەر لەبەر ئەم هۆیەش بێت جار جار چالاکی خۆی لە بواری هونەری شێوەکارییەوە دەگوێزێتەوە بۆ بواری ئەدەب. بە واتایەکی دیکەش ئەشێ بڵێین ئەم چیرۆکە ئەزموونێکی خودی چیرۆك نووسەکە خۆیەتی، هەرچەندە ڕاناوی کەسی سێیەمی تاکیشی بەکاربردووە (ئەو)، بەڵام ئەم (ئەو)ە (ئەو)ەکەی (یولیوس سیزار)ە واتا (ئەو)ی لەجێی ڕاناوی کەسی یەکەمی تاك (من) بەکاری بردووە. (یولیوس سیزار)و لە سیاسییە نوێیەکانیش (ونستۆن چێرچڵ) لە نووسینی یاداشت و تۆمارکردنی کردەوەو بەسەرهاتەکانی خۆیان دا لەبری بەکاربردنی (من) کە ڕاناوی کەسی یەکەمی تاکە هاتوون (ئەو) یان بەکار بردووە کە ڕاناوی کەسی سێیەمی تاکە بۆیە پێی دەگوترێت (ئەو)ی (یولیوس سیزار).

(حسام حکیم) لە بەکارهێنانی ئەم شێوازەدا مەبەستی ئەوە بووە سیفەتێکی گشتی بە ئەزموونێکی تایبەتی بدات و سیفەتە خودییەکەی لێ داماڵێت و وەکو شایەتێکی بێلایەن هەڵیسەنگێنێت و، مامەڵەیەکی مەوزووعیانەی لەگەڵ دا بکات و لە شێوەی گێڕانەوەیەکی مەوزووعیانەدا دەریبڕێت. تا ڕادەیەکی زۆریش سەرکەوتوو بووە لە بەکاربردنی شێوازەکەو بەجێ هێنانی مەبەستەکەشیدا. بەڵام ئەمە بە مەرجی ئەوەی کە وەك یاداشتێك یا پارچە پەخشانێکی هونەریی چیرۆك ئامێز بڕوانینە دەقەکە و لەو ڕوانگەیەوە مامەڵەی لەگەڵ دا بکەین کە زمانەکەی زمانێکی شاعیرانەی ڕەوان و بێگرێ و گوڵەو گەلێك وێنەو، هاودژە وێنەو، لێکچوواندنی ناسك و ڕوونی هونەری و بەپێزی تێدایە کە لە خزمەتی دەقەکەدایە، کورتی و چڕوپڕ و خەست کردنەوەش لایەنێکی باشەی شێوازی دەقەکەیە و پڕ بە پێستی بابەتەکەو مەبەستەکەی نووسەریشە.

وەلێ ئەگەر وەك کورتە چیرۆکێکی هونەریی تەماشای دەقەکە بکەین ـ وەك خاوەنەکەی پێی خۆشە ـ ئەوسا تووشی هەناسە ساردییەك دەبین و، گەلێك کەم و کورتی و کون و کەلەبەرمان دەکەوێتە پێش چاو کە ئەو لایەنە باشانەی کە پێشتریش ئاماژەمان بۆ کردن لە هەق پڕکردنەوەیان نایەن. دەقەکە وەك چیرۆك: ڕەگەزی شوێن و کاریگەری شوێنی تێدا پشت گوێ خراوە. شوێنیش وەك دەیزانین ڕەگەزێکی گرنگی چیرۆکە بەتایبەتی لە چیرۆکی نوێدا. جگە لەوە ڕەگەزی کاتەکەشی تەنها کاتی فیزیکی ڕووتەو سیفەتی کاتی ئەفسانەیی و مرۆڤانەی دەروونی تێدا نییە. نە پەیوەندی بە ڕابوردووەوە هەیەو نە بە داهاتوویشەوە وەکی دیکە دەتوانین بڵێین کاریگەر نییە نە بەسەر کەسەکەوەو نە بەسەر ڕووداوەکەشەوە. کاتی نێو دەقەکە ئەو کاتەیە کە ئامێری کات ژماردن دەیژمێرێت وبەس، دەنا قووڵایی و بارستایی و مەودای فەلسەفی و دەروونی نییە، بۆیە پاڵەوانەکەش ناگۆڕێت و چۆن دێتە نێو ڕووداوەکەوە هەر ئاواش لێی دەردەچێتەوە. ڕووداوەکەو، شێوازی گێڕانەوەکەش پەرە ناستێنن و لە چ خاڵێکەوە دەست پێ دەکەن هەمدیس لەوێدا یەك دەگرنەوەو، لەشێوەیەکی بزانەییدا خول دەخۆن بە دەوری خۆیان دا، دەقەکە بە سەرنەکەوتنی پاڵەوانەکە دەست پێدەکاو بە دڵنیابوون لەو سەرنەکەوتنە کۆتایی دێت.

(منیش هەروەکو ئەو کاروانانە چاو دەبڕمە چاوەکانت، تاوەکو دەگەمە دورگەی مەبەست،... بەڵام بڕوا بکەو دڵنیاشم کە نە چاوەکانی تۆو نە هەموو ئەستێرەکانی ئاسمان، ڕێگای ئەو دورگەیەم نیشان نادەن...)

جیاوازی نێوان مامەڵەکردنی ئەو ڕەگەزانەی کە لەسەرەوتر باسمان کردن لەوانەیە سەرەتا بچووك و کەم بایەخ بێنە بەرچاو، بەڵام زۆر گرنگن بۆ جیاکردنەوەی چشنێکی ئەدەبی لە چەشنێکی دیکەی ئەدەبی. جیاوازی نێوان چیرۆکی هونەریی و سەربردەو، یاداشت و، مەقالەی چیرۆك ئامێزو... هتد هەر بەقەد تاڵە موویەکە، بەڵام بەسە بۆگواستنەوەی دەقێك لە بوارێکەوە بۆ بوارێکی دیکەی ئەدەبی.. (خەوزڕان) ەکەی (حسام حکیم) خاڵی یەکگرتنەوەو هێڵی هاوبەشی نێوان پەخشانی هونەریی چیرۆك ئامێزو کورتە چیرۆکی هونەریی تێدا بەدی دەکرێ، وەلێ سیفەتە تایبەتییەکانی کورتە چیرۆکی هونەریی تێدا بەرچاو ناکەون.

ـ ٣ ـ

بەسەرهاتی چیرۆکی (ئارەزوو)ی (ڕەوف بیگەرد) بەسەرهاتێکی درێژخایەنەو، پشێك درێژە دەکێشێت، جگە لەوەش چەندین جار پات دەبێتەوە. ئەمەش بێگومان بۆ کورتە چیرۆك نا ئاسایی و لە ڕادە بەدەرە، ڕەگەزو کەرەسەکانی کورتە چیرۆك هەر لە کات و شوێن و کەسەکانەوە بیگرە تا دەگەیتە قەوارەی دەقەکەو ژمارەی وشەکانیشی دیارین و، هەر چ زیادەڕۆیی و دەس بڵاوی و، بەرفراوانی و شڵ وشاوی و درێژدادرییەکی تێدا بکرێت بە خراپ بەسەریا دەشکێتەوە، ئەمە لە ئاستی دەقەکەدا واتا لە شێوازی گێڕانەوەکەدا ڕاستییەکی بەڵگە نەویستە، بەڵام ئەمانە بۆ پلەی پێش بوونە دەقی ڕووداوە ڕووتەکە مەرج نین و ئەشێ هەموویان یا هەر هیچ نەبێ هەندێکیان پێکەوە لە بەسەرهاتێکی درێژخایەن دا بەرچاو بکەون. ئەمەش بێگومان ئەو بۆچوونە کۆن و باوە پووچ دەکاتەوە کە دەڵێ بەسەرهاتی دوورو درێژ، یا دووبارەوە بوو بۆ بابەتی کورتە چیرۆك دەست نادەن، چونکە دووبارە بوونەوەو درێژخایەنی ڕووداوی بەر لە بوونە دەق گرفتی بێ چارەسەر نین و چیرۆك نووسی وردەکارو دەس ڕەنگین دەتوانێت بە چەندین شێوەی هونەریی چارەسەریان بکات و نەهێڵێت بەوجۆرەی کە لە پلەی پێش بوونە دەق دا هەن

ئاواش لە دەقەکەدا بەدەر بکەونەوەو ببنە هۆی بارگرانیو بێزارکردنی خوێنەر.

ئەم جۆرە ڕووداوو چارەسەرە هونەرییە لە (ئارەزوو) دا بە ڕوونی بەر چاو دەکەوێت. پاڵەوانی چیرۆکەکە کە هێشتا لە پۆلی چواری سەرەتاییدایە تووشی ئەزموونێکی سەرەتایی سێکسانە دەبێت. ئەم ئارەزووی فاق نانەوە و ڕاوکردن دەیباتە بەر دەرکی ماڵێك و، ئارەزووی سێکسانەی کچە هەرزەکارەکەی ماڵەکەش کە لەم گەورەترە لە تەمەن دا وای لێدەکات کوڕە بەرێتە ماڵەوەو، جارێ بە بیانووی گەرم کردنەوەو جارێ بە هەڕەشەی قەدەغەکردنی ڕاو و جارێکش بە باسوق و هەنجیرە وشکە دەسەمۆی دەکاو، بە شێوەیەکی سەرەتاییانە تامەزرۆیی خۆی بە کوڕە دەشکێنێت و هیچ نەبێ کڵوکۆی ئارەزووە هەڵچووە هەرزەکارانەکەی پێ دادەمرکێنێتەوە. ئەم ئەزموونە چەند جارێك دووبارە دەبێتەوە، کار لە دەروونی کوڕەکەش دەکا وردە وردە پێی ڕادێو خووی دەداتێ.

(ئەم یاریە چەند جارێکیتر دووبارە بووەوە، من ئالوودەی بووم، بەڵام نەم ئەزانی خۆشیەکەی لە چیدایە؛ باسوق و هەنجیرەکە. ترسی قەدەغەکردنی فاقەنانەوە، یان شتێکیتر کە هەستی پێ ئەکەم و ناتوانم بیڵێم.)

(کاڵێ) شوو دەکات و لە ئەزموونەکە دەکشێتەوە. کە دەگەڕێتەوە ماڵە باوان بە ڕێکەوت کوڕەکە چاوی پێ دەکەوێت هەستێکی دیکەی لەلا پەیدا دەبێت.

(.. یەکەم جارم بوو کە ڕوانینەکەیم سەیر هاتە بەرچاو، چونکە لە چاویا ئارەزووە سەرکێشەکەی جاران و گڕە شینەکە دیار نەبوون، تەواو لەچاوی دایکم ئەچوون..) ڕۆڵی (کاڵێ) لێرەدا کۆتایی دێت، بەڵام کوڕەکە ناتوانێت لەو هەڵس وکەوتەی خۆی بگەڕێتەوە و لەبیری بەرێتەوە. ئەمە وای لێدەکات کە بەبێ ئاگای خۆی پەنا بەرێتە بەر (گۆڕینەوە)، گۆڕینەوەی لایەنی دووەمی لە دەس چووی ئەزموونەکە بەشوێنی ئەزموونەکە. یا وەك خۆمان بەکوردی دەڵێن، بۆنی کاڵێ دەنێت بە دارو دیوارو دەرگاو خانووو گەڕەکەکەوە و ئیتر وەخت و ناوەخت و بە گەورەیی گەورەتریش سەردانی ئەو گەڕەك و خانووە دەکاتە خوو. دەشزانێ ئەو کارە بێسوود و بێ واتایە وەلێ چەندین جار دووربارەی دەکاتەوە. ڕووداوەکەش چەندین ساڵ هەر بەو جۆرە درێژە دەکێشێت و پشتێك دەبات.

(کە ئەگەیشتمەوە ئەو گەڕەکەو، لەو کوڵەو، لەو کۆڵانە نزیك ئەکەوتمەوە، هەنگاوەکانم ئەبوونە بزمارو موگناتیسی ئەو خانووە بەکێشی ئەکردن (...) من لە ناخەوە ئەمزانی ئەم وەستان و خۆبە ڕابووردوا هەڵواسینە خوویەکی پووچەو گەمژەییە، بەڵام هەندێك جار و لە تەمەنێکی تایبەتیدا مرۆڤ لەگەڵ مەبەستێکدا ئەژی کە ئەیش زانێت بەدی نایەت (. ٥.) کەچی شوێنەوارەکەی ئەمەندە لە قوولیدایە هەمیشە چاوە چاوی بەدیهاتنی پێ ئەکات. (...) ئێستایش کە ڕێم دەکەوێتەوە گەڕەکە کۆنەکەمان وەك یەکێك لە دواوە پاڵم پێوە بنێت (...) کاتێك لەبەر دەم هەمان دەرگادا وەستاوم (...) لەوە بە ئاگام کە ئەم ڕەفتارە گەمژەییو بێ هوودەییەکی ڕووتە، دارو دیوار پەرستنەو هیچی دی، بەڵام چیبکەم، هەندێك جار مرۆڤ چەندە لەبیرکردنەوەو بۆچووندا ڕاست بێت کەچی بەو پێیە ناجووڵێتەوە.)

وەلێ سەرەڕای هەموو ئەم سەرزەنشت و گازەندە لەخۆکردنەش، سەرباری هەموو هەست بە نائومێدیو بێهوودەییەش پاڵەوانەکە، وەکو هەموو دیاردەیەکی هەمیشەیی مرۆڤانە دەس لە خووەکە، لە خۆشەویستییەکەی هەڵناگرێت و ئالاکەی دەداتە دەست نەوەی داهاتوووەوە لەسەری دەڕواو لەشوێنی نابێتەوە.

(ئەمڕۆ بۆ دواجار ڕێگام کەوتەوە دەوروبەری کۆڵانەکە (...) من ڕێوارێکی شەکەت بووم، بۆ حەسانەوە لامدا. لەبەر کۆشکێکدا وەستام، کچێکی تەواو پێگەیشتووی سوورکار سەری هێنایە دەرەوە پاشان هاتە سەر جەمەری کۆڵانەکە، هەر ئەت وت ـ کاڵێ ـ ی دایکیەتی. لەبەردەم کۆشکەکەی شوێن ماڵێکی تردا کوڕێکی گەنم ڕەنگی تازەهەڵچوو کە هەر لەخۆمی ئەکرد وەستابوو، بێ ئاگا کەوتبوونە چاوچاوێن و بزەو ئاماژەکردن. کە منیان بینی نەسڵەمینەوەو نە شوێنەکەیان گۆڕی، دیمەنەکە تەواو حەساندمیەوە چونکە هەستم کرد هەموو شوێنەوارە کۆنەکان وایان لێ دێتەوە.)

خانووی داتەپیوو، لەرزۆك و ئێرەتی لەنێو دەچن و کۆشك و تەلار جێی دەگرنەوە، کۆڵانی باریك و تەنگەبەرو پێچاوپێچ و بن بەست دەبنە ڕاستە شەقام، عەشقی بە ترس و لەرزی نەوەکانی ژێرزەمین و ژووری تاریکی داخراو و پشت پەردەش حەشارگە جێ دێڵێو بەبێ ترس و سڵەمینەوە دێتە سەرشەقام و بەر ڕووناکی ڕۆژ.

ئەمە سروشتی ڕاستەقینەی ژیانەو ژیان هەمیشە لە پێشکەوتن و گەشەکردنی خۆی ناکەوێت و هەردەم لە باشەوە بەرەو باشتر دەڕوات. ئەوەی لای نەوەیەك خەوو خەیاڵی بێهوودەو نەزۆکە لەکن نەوەیەکی دیکە دەبێتە ڕاستییەکی ڕۆژانەو تیایدا دەژین. ئەمە پەیامی ڕاستەقینەی (بێگەرد)و کرۆکی ناوەڕۆکی (ئارەزوو)ە. لێرەشەوە دەچینە سەر لایەنە هونەرییەکانی چیرۆکەکەو ئەو شێوەو شێوازانە دەخەینە بەر ڕۆشنایی کە چیرۆك نووس لە گێڕانەوەی ئەم بەسەرهاتە درێژخایەنەدا بەکاری بردون.

یەکەم: درێژخایەنیو دووبارەبوونەوەی ڕووداوەکە لە سروشتی بابەتەکەوە سەرچاوە دەگرێت کە پەیوەندی نێر و مێیە ئەمەش وەك دەزانین چ لە ژیانی تاکە کەس و چ لە ژیانی هەموو مرۆڤایەتیدا، پەیوەندییەکی بەردەوام و هەمیشەییەو ڕەنگە لە شێوەی جیا جیادا خۆی پیشان بدات وەلێ هەرگیز خامۆش نابێت مەگەر لەگەڵ مەرگە دا، ئەویش بۆ مرۆڤی تاك. خوودانی کوڕەکەش بە شوێنی ئەزموونەکەو کارتێکردن و سەرهەڵدانەوەی بەردەوامی تاقیکردنەوەکەو دووبارە بوونەکەشی دەست هەڵبەست نییە بەڵکو ڕاستییەکی زانستییەو کێشییەکی باوی زانستی دەروونەو بەر لەم بەرهەمەی بێگەرد لەچەندین دەقی ئەدەبیو زانستیدا ئەوەمان دیوە کە قۆناغی منالی قۆناغێکی گرنگی مێژووی ژیانی مرۆڤەو هەندێ ئەزموونی ئەم قۆناغەش ڕێی تێدەچێت باڵ بەسەر هەموو تەمەن دا بکێشێت یا هەر هیچ نەبێت لە هەل ومەرجی تایبەتیدا سەرهەڵ بداتەوە.

دووەم: کاتی فیزیکی ڕووداوە ڕووتەکەی پێش بە دەق بوون لە کاتی گێڕانەوەکە یا وەکیدیکە بڵێین لە کاتی ڕووداوی ناو دەقەکە درێژترەو پێش گێڕانەوەکەش تەواو دەبێت. واتا کاتی ڕووداوەکە لە کاتی گێڕانەوەکە درێژترە، بەڵام تەواو دەبێت ئەوجا پاڵەوانەکەی دەگێڕێتەوە بۆیە چیرۆك نووسیش لە شێوەی کاتی ڕابووردودا دایڕشتووە. بەکاربردنی چیرۆك بێژێکی زاتی واتا گێڕانەوەی بەسەرهاتەکە بە خوودی پاڵەوانەکەی لێرەدا بۆ ڕووداوێکی ئاوا دوورو درێژ ئەمیش هەر پێویستییەکی هونەرییو لە چیرۆك بێژێکی مەوزووعی لەبارترە، چونکە هیچ خوێنەرێك لێی ناپرسێت: تۆ بۆ ئەوەندە

وەخت و ئەوەندە جارە بە شوێن ئەم کەسەوە بوویت؟!.

سێیـەم: چیـرۆك نووس بە دەستی ئەنقـەست زنجیـرەی باوی (سـەرەتـا، ناوەڕاست، کۆتـایی) چیـرۆك دەکـات و بەسـەرهـاتـەکـە لەسـەر شێوەی (نـاوەڕاست، سـەرەتـا، کۆتـایی) دادەڕێـژێتـەوە واتـا لەجێی (سەرەتا) دێت لە (ناوەڕاستەوە) دەست پێ دەکا.

(ئـەوسـا گەورە بووم دەمـێـکـیش بوو لە ڕووداوی ناو ئەو خانـووە دوورکـەوتبـوومـەوە.) لەوێشـەوە ئینجـا بەپێی پێویستی دەگـەڕێتـەوە کاتی ڕابـوردووتـر و کاتی ئێـستـا. بەڵام ڕووداوەکەی سەرەتا لە شێوەی (دیمەن) ێکی زینـدوودا پێشکـەش دەکـات، ئەم بچـڕبچـڕ کردنەی کاتە فیزیکی‌یەکە دەبێتە هۆی تامەزرۆکردنی خوێنەر و دواییش کە بەخۆی دەیداتەوە دەم یەك هەست بە چێژی دۆزینەوە دەکات.

چوارەم: لە کاتی دووبارە بوونەوەی وەك یەکی ڕووداوەکان دا بۆلەوەی خوێنەر بێـزار نەکـات دێت پەنـا دەبـاتـە بەر شێـوازی (کورت کردنەوە) و بەسـەریەکەوە باس کردنی ئەو ڕووداوە لێکچـووانـە وەك سـەرەتـای بەشی یەکـەم. پاڵـەوانی چیـرۆکـەکـە - چیـرۆك بێـژەکـە - کە لەم بەشـەدا باسی دووبـارە بوونـەوەی هاتـوچـۆکـردنی گەڕەکەکە دەکات، لەبەر نەبوونی جیاوازی گرنگ لە نێوان ئەو هاتـوچـۆیـانـەدا دێت هەمـووی لەیەك دەدات و باسی هەموویان بەسەر یەکەوە دەکات ئیتر خۆی لە قەرەی ژمارەو کات و چۆنێتیان نادات.

(کـە ئەگـەیشتمـەوە ئەو گەڕەکـەو، لەو کۆڵانـە نزیـك ئەکەوتمەوە هەنگاوەکانم ئەبوونە بزمار و موگناتیـسی ئەو خانووە بەکێشی، ئەکردن، ئەگەر دەرگاکە لەسـەر پشـت یان لایـەکی کراوە بوایـە، بە ئارەزوویـەکی پڕەوە چاوم بۆ ناو حەوشـەکـە هەڵـدەخـست و تیـر تیـر بەدەر و دیـوارەکـەیـدا هەڵمـدەڕوانی، تاسـەیـەك، ئارەزوویەکی سەرچڵ و شێت لە شوێنی خۆیاندا کڕ ئەبوون و ئەحەسانەوە....)

لە سـەرەتـای بەشی دووەمیـش دا کە دێتـە سـەر باس کردنی ڕاوکـردن و فاقـە نانەوە و دووبارەبوونەوەی ڕۆژانەی ئەو کارە بە هەمان شێوەو بۆ هەمان مەبەست پەنا دەباتەوە بەر (کورت کردنەوە).

(کـە لە قوتـابخـانـە دەگـەڕامـەوە بە پەلـە نانـەکـەمم دەخـوارد چاوم ئەکەوتە لە دەرگـادانی ئاسمـان (...) فاقـەکـەمم هەڵـدەگـرت و بەرەو باخەکەی حاجی ڕەشیـد ئەکـەوتمـە ڕاکـردن، لەو شوێنەدا. کە ماڵان تەنەکەیان تیا خاڵی ئەکرد فاقەکەم ئەنایەوە....).

کە سەرنجی کاتی فرمـانەکانی ئەم پارچە دەقانەش دەدەین: (ئەگەیشتمەوە، ئەکـەوتمـەوە، ئەبـوونـە، ئەکـردن، هەڵدەخـست، هەڵمدەڕوانی، دەخوارد، ئەکەوتە، هەڵدەگرت، ئەکەوتمە، ئەنایەوە...)

دەبینین هەموو فرمانی ڕابوردووی بەردەوامن و بەردەوامی و دووبارە بوونەوەی ڕووداوەکـە دەسـەلمێنن. دەبێ ئەوەش بڵێین کە چیـرۆك بێـژ ئەو شێـوازی کورت کردنـەوەیـە بۆ ڕێ پاك کردنـەوەی (دیمـەن)ە بنەڕەتی‌یەکە یا دروست تر بێژم بۆ پێشکەش کردنی ڕووداوە سەرەکی‌یەکە بەکار دەبات.

پێنجـەم: کە کات گرنگی پەیـدا دەکات و کار لە سەرەنجام و ڕێڕەوی ڕووداو و هەڵوێستی کەسەکان دەکات، ئەوسا بەکاربردنی (دیمەن) پێویست دەبێت. لە (دیمـەن) دا کاتی ڕووداوی پێش بوونـە دەق و ڕووداوی ناو دەقـەکـە یەکـسـان دەبنـەوە و هەمـوو شتێـك وەك خۆی چۆن ڕوویـداوە ئاواش بە دوورو درێژی دەگێـڕێتـەوە لە دەقـەکـەدا، ئەمـەش بە ڕوونی بە باسی چۆنێتی یەکتر ناسین و دەسـت پێکـردنی پەیـوەنـدی نێـوان پاڵـەوانەکەو کاڵێ و گفتوگۆکانیانەوە دیارە لە بەشی سێیـەمی چیـرۆکـەکـەدا کە هەر بە تەنها تام و چێژو قەوارەو مەرجەکانی کورتـە چیـرۆکێکی تێـدایـە، بەڵام ئەو ئەنجـامـە بە دەستـەوە نادات کە چیرۆك نووس مەبەستێتی.

شەشەم: بە پێچەوانەشەوە کە کاتی فیزیکی ڕووداوەکە - پێش بوونە دەق - بەبێ جێهـێـشـتـنـی شوێـنـەوارێـکـی گرنـگ تێـپـەڕ دەبێـت ئەوسـا لە دەقـەکـەش دا لەگـەڵ (سفـر)دا یەکـسان دەبێتەوە. بە واتایەکی دیکە دەتوانین بڵێین لە دەقەکەش دا دەپەڕێنرێت.

(.. ئەوسـا هەمـوو جارێـك خۆم هەڵـدەخـەڵـەتاند، کەچی ئێستایش کە ڕێم دەکەوێتەوە گەڕەکە کۆنەکەمان....)

لەنێوان ئەم (ئەوسا) و (ئێستایش)ەدا کاتێکی نادیاری هەیە کە بێ بەها هاتووە و تێپەڕیوە بۆیە چیرۆك بێژەکەش لە دەقەکەدا لە سەری نەوەستاوەو پەڕاندویەتی.

لە شوێنێکی دیکەش دا دەڵێ:

(کـاڵێ شووی کردو دوای ماوەیـەك گەڕایـەوە ماڵی باوکی....) ئەم (دوای ماوەیـەك) ەکـەش دیسـانـەوە کاتێکی نادیـاری‌یـەو، بەبێ ڕووداوی گرنـگ بەسـەرچـووە بۆیـە لە دەقەکەدا پەڕێنراوە دەسنیشان کردن و پەڕاندنی ئەم جۆرە کاتە فیزیکی و بێ‌نرخە هونەرییانە تا ڕادەیەکی زۆر مەودای کاتیی دەقەکە کورت دەکاتەوەو لە گێڕانەوەی دوورو درێژی ناپەسەندو ناپێویستیشی دەپارێزێ:

حەوتـەم: چیـرۆك بێـژ لە هەنـدێ شوێنی دیکـەدا، بۆ هەڵـەنگاندی ئەنجامی ماوەیەکی بەسـەرچوو و پەڕینەوە بۆ ماوەیەکی دواتر دێت بە بەکاربردنی وەسفێکی زاتی ڕەزمی گێڕانەوەکە بەتەواوی خاو دەکاتەوە.

(.. ڕووداوەکـان یادگـارێکی تاڵ و شیـرینیان لا بەجێ هێشتبووم، وەك هەموو ئەوانـەی‌تـری ڕابـووردوو کە زۆر جار بەرۆکـت لەدەسـت ئەگـرن و ڕات ئەتـەکێنن، یان ئەبنـە ئەستێـرەی شەوە تاریکەکان و بە ئاسمانی ئەو ڕابووردووە هەڵـدێن و ئەکـەونـە جریـوە، یان لە بیابانی وشکی لەشتا ئەبنە بارانی خوڕزم و دەمار و ماسولکە ماندووەکانت پاراو ئەکەن....)

لە سەرەتـای بەشی سێیـەمی دەقـەکـەش دا بە وەسفێکی مەوزووعی کەش و شوێنی ڕووداوەکە، گێڕانەوەکە بە تەواوی ڕادەگرێت.

(ئەو ڕۆژەی کارەساتەکەی تیا ڕوویدا بەفر میوانێکی ئێسك سووکی درەخت و گوێسـوانـەو دڵی من بوو، دنیـایـەکی کپ و هێور، ئەت ووت زەوی لەوەستان کەوتووە و هیچ گیانداریکیش زمانی گۆ ناکات، سروشت لە مشتی بێدەنگیا تاسابوو.)

بێگـەرد بە بەکـار بـردنی ئەو شێوازنـەی کە پێشتر باسمان کردن توانیویەتی تا ڕادەیـە زۆر بەسـەر گرفتی دووبـارە بوونـەوە و درێـژخـایـەنی بەسـەر هاتی چیـرۆکـەکـەی‌دا زاڵ بێت. وەلێ هەر لە سەرەتـاوە دەیتـوانی بەشی یەکـەم و دووەمی نەخـاتـە سەر و ئەوانیش وەك ئەو دوایی بەشـە قرتـاوەکان بقرتێنی و هەر یەکـسـەر لە بەشی سێیـەمـەوە - لە دیمـەنی یەکەم جار بەیەك گەیشتنی کوڕەکە و کاڵێـوە - دەسـت پێ بکـات و بە کۆتـایـی هاتـنی بەشی چوارەم کۆتـایی بە چیـرۆکـەکـەی بێنێ. ئەوەی لە بەشی یەکـەم و دووەم دا باس کراوە لە بەشی سێیەم و چوارەمش دا کەم و زۆر دووبـارە بوونـەوە بۆیـە لابردنیان - بەشی

یەکەم و دووەمم مەبەستە ـ نابنە هۆی کەم و کورتی لەو دوو بەشەکەی دیکەدا کە تەواوی مەبەستەکەی چیرۆك نووسیش بەدەستەوە دەدەن، بەسەریەکیشەوە هیچ کون و کەلەبەریکیان تیدا نامێنیت، پێویست بە بوونی بەشی یەکەم و دووەم بکات بۆ پڕ کردنەوەیان. خوێنەر هەر لە بەشی سێیەم دا لە ڕاستی ئارەزووی فاقەنانەوەی کوڕەکەو ئارەزووی هەرزەکارانەی کاڵی و چۆنێتی بەیەك گەیشتنی ئەو دووەو، لەیەك دابڕان و خوولیای دواتری کوڕەکە ئاگادار دەبێتەوەو، لە بەشی چوارەمیش دا لە ڕاستی ئاکامی ئەزموونەکەو مەبەستی چیرۆك نووسەکەش دەگات و بۆ چێژ وەرگرتن و تێگەیشتنی دەقەکە چ پێویستی‌یەکی بەو زانیاری‌یە زیادانەش نی‌یە کە لە بەشی یەکەم و دووەمی چیرۆکەکەدا بەرچاو خراون. چیرۆك نووس خۆی لە پەراوێزی چیرۆکەکەدا گوتوویەتی ئەم چیرۆکە:

(دیمەنیکە لە چیرۆکیکی دریژی تەواو نەکراو. . . .) بۆیە منیش پرکیشی دەکەم و نیزم خوزگە پتر دەستی لی دادەگرت و بەشی یەکەم و دووەمی دەخستە سەر بەشە قرتاوەکانی دیکە.

جگە لەمە دایالۆگیکیش بەتایبەتی سەرنجی ڕاگرتم، لەو دایالۆگەدا کاڵی بە کوڕەکە دەڵی: (ـ تۆ تاقانەیشی، دایك و باوکت زۆریان خۆش ئەوێت، وایە؟) بۆ (خۆشەویستی دایك و باوك)ەکە ئەوا ئاسایی و زانینی زەحمەت نی‌یە بۆ کاڵی. وەلی بۆ (تاقانە)ی‌یە کە ئەمە زۆر تایبەتی‌یە: لە دەقەکەدا ڕوون نی‌یە کاڵی چۆنی زانیوە.

- ٤ -

دەس و دیاری (طاهر صالح سعید)ی چیرۆك نووس بۆ ژمارە (١٤٨)ی گۆڤاری (بەیان)ی تایبەتی چیرۆك: (کەلاوە)و، (ئەم شەو)و، (پەلە)و، (خەلات)و، (تۆ بلێیت؟!) بوون کە لەژێر ناونیشانی گشتی (پێنج چیرۆکی زۆر کورت)دا کۆی کردوونەتەوە.

قەواری ئەم چیرۆکە زۆر کورتانەی (تاهیر) لە چەند دێڕیك و، ژمارەی ئەو وشانەشی کە لێیان پێك هاتوون لە چەند وشەیەك تێ‌ناپەڕن. هەرە درێژەکەیان کە (پەلە)یە لە سنووری سەدو شەست وشە دەرناچێت و هەرە کورتەکەشیان کە (کەلاوە) بە شەست وشە تەواو ناکات، ئەو سیانەکەی دیکەشیان سەدو پەنجا وشە تەواو دەکەن و ناکەن. قەوارەی ئاوا وردی وەك ئەمەش بێگومان بەسەر هەموو ئەو دوایی ڕەگەزکانیش دا دەشکێتەوەو، پێی سەرەتا و ناوەڕاست و کۆتایی و، کات و شوێن و ڕووداوو کەس و گێڕانەوەو وەسف و هەموو وردو درشتێکی دیکەی بەرهەمەکەش دەگرێتەوەو، لە هەموو هەڵس و کەوتێك و مامەڵە کردنێکی چیرۆك نووسەکەش دا ڕەنگ دەداتەوە. هەڵوێستی وا هیچ خاوە خاو و خۆ خەریك کردن و درێژە پێدان و بە دەمەوەدان و زیادەڕۆیی‌یەك هەڵ ناگرێت و هەموو شتێك دەبێ بە گوێرەی پێویستی و گرنگی بایەخی بدرێتی و بە کەمترین وشە دەربڕێت و لە کورتی ببڕێتەوە. کورتی و، ڕوونی و، سادەیی و، خێرایی مەرجی سەرەکی چیرۆکی زۆر کورتی سەرکەوتوون، ئەمەش بێگومان بەستراوە بە وردی تێڕوانین و، وشیاری و شارەزایی و، زیرەکی و زرنگی چیرۆك نووسەوە و ویست و ئارەزووی ڕووت و حەزی لاسایی‌کردنەوە دروستی ناکات و نایهێنێتەدی.

(کەلاوە)ی تاهیر تەنها (٥٧) وشەیە وەلی لە ڕاستی‌دا کارەساتێك دەگێڕێتەوە، پیرۆزی شوێن و پەیوەندی گیانی مرۆڤ و شوێن بەرجەستە دەکات، باسی ڕەنگدانەوە و کارتێکردنی کێشەو وەرچەرخان و گۆڕانکاری‌یە مەزنە مێژوویی‌یەکانی سەردەم و کاردانەوەی مرۆڤی چاو قایم و خاوەن هەڵوێستمان بۆ دەکات. ئەنجامی مل ملانێ‌یەکی ناتەبای لاسەنگی دیاردەیەکی نوێی بێ‌بەزەیی و پیرە دایکێکمان بۆ تۆمار دەکات کە ئامادە نی‌یە بۆ کۆشك و تەلاریش دەست لە کەلاوە کۆنەکەی خۆی هەڵ بگرێت، پەیوەندی پیرە دایك و کەلاوە هێند گەرم و گوڕ و گیانی بە گیانی‌یە تا دەگاتە ئەوەی گیانی لەگەڵ دا دەرچێت.

(کەلاوە) ئاوا دەست پێ‌دەکات: (دەگێڕنەوە دەڵێن شەقامیکیان بری کەلاوەی پیرە دایکێك ڕێی پێ‌گرتن.)، دوو وشەکەی سەرەتابخەینە لاوە سەرەتای گێڕانەوەی چیرۆکەکە دادەمەزرێنن تەنها حەوت وشە بە دەستەوە دەمێنن. (تاهیر) بەو حەوت وشەیە کات و، شوێن و، ڕووداوەکەو، سروشتی کەسە سەرەکی‌یەکەشی دەس نیشان کردوە. جگە لەوەشی کە هەر وشەیەك لەو وشانە ئەرکێکی هونەری پێویست بەجێ دێنن لە هەمان کات دا نابنە هۆی ڕاگرتن یا خاوکردنەوەی ڕووداوەکەش، بەڵکو بە پێچەوانەوە هەتا دێت بەرەو پێشتریشی دەبەن ولە کۆتایی نزیکی دەخەنەوە ناتەبایی مل ملانێکش هەر لەم ڕستەیەی پێشوودا بەرجەستەکراوە. لە کۆتایی وشەی (شەقامیکیان)و، (پێ‌گرتن) ئەو (ان)ەی دوای وشەی یەکەم و ئەو (ن)ی دوای وشەی دووەمیش ڕاناوی کەسی سێیەمی کۆی لکاوی نادیارن و ئاماژەن بۆ لایەنی‌دووەمی مل ملانێکە. سەنگەلایی و ناتەبایی و نارەوای مل ملانێکەش ئا لەمەدایە کە ئەوان (کۆ)ن و پیرە دایك تەنها و (تاك)ە.

وشەی لێکدراوی (پیرە دایك)یش وشەیەکی فرە ئەرکە لەم دەقەدا. لە سەریکەوە (ڕەگەز)ی کەسەکە دەسنیشان دەکا کە (ئافرەت)ە، لە سەریکی دیکەوە باری کۆمەلایەتی دیاری دەکا بەوەی کە (دایك)ە، لە لایەکی دیکەشەوە تەمەنی دەردەخا کە (پیر)ە، وەکی دیکەیش باری دەروونی ڕووندەکاتەوە و پاکانە بۆ بێ تەماعی و هەڵوێستی نەگۆڕ و خۆشەویستی کەلاوەکەی دەکات کە جێی ژیان و یادگارەکانیەتی. ئەمەش لە ڕستەی دووەمی دەقەکەدا بەدەردەکەوێتەوە کە کۆشکێکی لە جیاتی کەلاوەکە دەدەنێ بەڵام ئەو پێی قایل نابێت و ڕەتی دەکاتەوە.

(لە بری ئەوە کۆشکێکیان دایە قایل نەبوو.)

لە ڕستەی سێیەمیش دا دەڵێ:

(. کە هاتنە سەر ئەوەی بە بەرچاوی‌یەوە بیخەن و بە یەکجاری شوێنەواری بسرنەوە گیانی سپارد.)

ئەمەش ئەنجامێکی سروشتی‌یەو، تەواو لەگەڵ ڕێڕەوی بەسەرهاتەکەدا دەگونجێت و، زۆر ئاسایشە ئاکامی مل ملانێکی ئاوا ناتەبا بە سەرکەوتنی (زۆر)و، ژێرکەوتنی (تاك)دا بشکێتەوە. شیاوی باسیشە کە ڕووداوەکە وەك ڕووداوی پێش بوونە دەق لێرەدا کۆتایی دێت، وەلی دەقەکە ڕاناوەستێت و بەردەوام دەبێت. چیرۆك بێژەکە دوای ڕاگەیاندنی مردنی پاڵەوانەکەو جێبەجێ‌کردنی پرۆژەی شەقامەکە دەگەڕێتەوە ساتەکانی پێش کۆتایی هاتنی ڕووداوەکەو دەڵێ:

(بەڵام بەر لەوە لە چاوتر ووکانێك دا بەوەدا گەیشت. دووا یادگارو بیرەوەری‌یە تاڵ و شیرینەکانی تەمەنی دوورو درێژی لەگەڵ ئەو کەلاوەیەدا بپێچێتەوەو بیبات. بیبات و بۆ شەقامە نوێ‌یەکەی جێ نەهێڵێت.)

وەرگەڕان و وەرچەرخانی کتوپڕ دیاردەیەکی باوە لە کۆتایی چیرۆکی زۆر

کورت دا، ئەم کۆتایی‌یەی (کەلاوە)ش بۆ ئەوە دەشێت بە جۆرێك لە جۆرەکانی وەرچەرخانی دابنێین. وەرچەرخانەکەش لەوەدایە کە پیرەداك با وەکو کەلاوەکەشی لەدەست دەدات، بەڵام دەتوانێت یادگارو، بیرەوەری‌یەکانی لەشەقامەکە بپارێت و لەتەك خۆی‌دا بیانبات، وەرچەرخانی واش خوێنەر قایل دەکا. ئەوەی دەمرێت ئەڵبەتە یادگار و بیرەوەری‌یەکانیشی لەتەك خۆی‌دا دەباتە گۆڕەوە. ئەمە راستی‌یەکی زۆر ئاسایی‌یەو زۆر لەخۆکردن و دەسکردی تێدا نی‌یە.

(کەلاوە) چیرۆکێکی زۆر کورتی سەرکەوتووو، بێ خەوشی نموونەی‌یە بۆیە هێندەشی لەسەر وەستاین.

(ئەم شەو) باس لە بابەتی مل ملانێی مرۆڤ و دوو دیاردەی سروشتی دەکات کە (بەفر)و (شەو)ە. پاڵەوانەکانی چوار کەسن، چیرۆك نووس بە تەنها شەش وشە، رەگەزو، نیشتمان و، نەتەوەو، تەمەن و، ئارەزووو، باری دەروونیی‌و کۆمەلایەتییان دەس نیشان دەکات: (. دوو کیژی بوخارست ی‌و دوو لاوی (چوار باخ)ی.).

چوار کەس بۆ چیرۆکێك لەم قەوارەیە زۆرە. بەڵام تاهیر بەسەریەکەوە لە شێوەی (کۆ)دا باسیان دەکاو ناهێڵێت بە تاك تاك دەرکەون، لەمەش دا سوود لە لێکچوونی هەڵس وکەوتی کەسەکان دەبینی‌و خۆشی لە دووبارە کردنەوە دەپارێزێت:

(تا ئەو دەمەی پاڵ ئەدەن بە نیوە شەوەوە ئەوان بەیەك دا دێن و دەچن. بۆیەکتری دەدوێن و گوێ لە یەکتر دەگرن. دەخۆن و دەخونەوە. (. . .) چوار قوڵی پشت پەنجەرەی ئەو ژوورە دەکەون. چاو دەبڕنە ئەو بەفرەو رادەمێنن هەر چواریان بیر لە شتێك دەکەنەوە. . . .).

بەکاربردنی ئەم شێوازەش تا رادەیەکی زۆر ـ ئامادەبوونی ـ گرانی ئەو چوار کەسە لە دەقەکەدا سووك دەکاتەوە. بەشێوەیەکی دیکە دەتوانین بڵێین دەرکەوتنی تاك تاکی کەسەکان کارێکی پێویست نی‌یە، بەڵام دەرکەوتنی بە (کۆ)یان زۆر پێویستەو پەیوەندی بە ئەنجامی چیرۆکەکەوە هەیە. پێکەوە بوونی مرۆڤەکانە ئەو شەوە ساردو دوورو درێژە دەکاتە شەوێکی خۆش:

(. . هەر چواریان بیر لە شتێك دەکەنەوە. ئەوەیش ئەوەیە کە شەوگاری شەوێکی دوورو درێژیان بەرێ کردو تامێکی ناوازەیان چەشت. بێ ئەوەی بە (زمان نە ئەمان هیچ لەوان و، نە ئەوان هیچ لەمان تێگەیشتبن.)) دەنا (تاك) لە مل ملانێی سروشت و مرۆڤ دا دەسەوەستانەو بە تەنها هیچی پێ ناکرێت، بەڵام (کۆ) ئەگەر ـ لە یەکیش نەگەن ـ هەر زاڵن بەسەر سروشتەکەدا. وەك دەبینین بوونی چوار کەسەکە پێویستەو، شاردنەوەشیان هەر پێویستە، چیرۆك نووسیش هەردوو مەبەستەکە پێکەوە ئەنجام دەدات بەبێ‌ئەوەی سەر لە خوێنەر بشێوێنێت یا تای هونەریی بەرهەمەکەی سووك بکات.

سەرەتای چیرۆکەکەش بە وەسف کردنی (شوێن) یا با بڵێین (سروشت) دەست پێ‌دەکات، وەلێ وەسفەکە وەسفێکی مەوزووعی رووت نی‌یەو بڵێی هەر بۆ رازاندنەوە یا دروست کردنی (باك گراوند)و چوارچێوەی گشتی رووداوەکە کرابێت، چیرۆکی زۆر کورت بواری وەسفی وای تێدا نی‌یە، بەڵام ئەوەی لێرەدا، لەسەرەتای ئەم دەقەدا دەبینرێت وەسفی لایەنی دووەمی مل ملانێکەیە کە (سروشت)ەکەیە. جگە لەوەپەیوەندی دوو کورە (چوار باخ)یەکەوە و (شوێن)ەکەش روون دەکاتەوە:

(بوخارست ئەم شەو لە وولاتەکەی ئێمە دەچێت. بەفر دەبێتە میوانی هەر ماڵێکی‌و رێی‌و بانەکان دەبەسترێن.)

ئەم وشەی (ئێمە)یەی کە لە دووەم رستەی دەقەکەدا بەرچاودەکەوێت، ئەوە دەگەیێنێت کە یەکێك لە کەسەکانی چیرۆکەکە دەیگێڕێتەوە واتا وا چاوەڕوان دەکرێت گێڕانەوەیەکی زاتی بێت لەسەر شێوازی راناوی کەسی یەکەمی کۆ (ئێمە) بڕوات، کەچی بە پێچەوانەوە هەر یەکسەر دوای ئەو دێرە گێڕانەوەکە لە گێڕانەوەیەکی زاتی‌یەوە دەبێتە گێڕانەوەیەکی مەزووعی و راناوەکەش لە (ئێمە)وە دەبێتە (ئەوان) واتا لە راناوی کەسی یەکەمی کۆوە دەبێتە راناوی کەسی سێ‌یەمی لکاوی یا نەلکاوی کۆ. (. . تا ئەو دەمەی پاڵ ئەدەن بە نیوە شەوەوە ئەوان. . . .) ئەمەش خەوشێکی هونەریی گەورەیەو نەك هەر لە چیرۆکی زۆر کورت دا، لە جۆرەکانی دیکەی چیرۆکیش دا پاساو نادرێت و پاکانەی بۆ ناکرێت.

رووداوی (پەلە)و، (خەلات) یش لەو جۆرە رووداوە رۆژانانەن کە چەند جارێك دووبارە دەبنەوە. چیرۆك نووس ئەو حاڵەتە لێکچووانە لە سەرەتای چیرۆکەکان دا کورت دەکاتەوەو وەکو باك گراوندێك دەیانخاتە پێش ئەو جارە تایبەتی‌یەی رووداوەکە کە خۆی مەبەستێتی بەرجەستەی بکات.

(پەلە) سەرەتا ئاوا دەست پێ‌دەکات: (رۆژانە بەرلەوەی هێشتا کەس پێ بنێتە ئەو دیو دەرگای ئەو فەرمانگەیە. دەنەوێتە گەسکەکەی‌و لەگەڵیدا دێت و دەچێت. بۆ جارێك و دووان و دە پیایدا دێتەوە. ئەو ئەوە پیشەیەتی. تا ئەودەمەی ئەو فەرمانگەیە خۆڵە مردووی بەسەرد دەکرێت و خۆی دەداتە دەست کڕی‌و بێ‌دەنگی.)ئەمە حاڵەتە گشتی‌یەکەیە و چیرۆك نووس بەو شێوەیە بە کورتی و بە خێرایی بەسەریا تێ‌دەپەڕێت دوای ئەوە ئنجا دێتە سەر ئەو جارە دیاری‌کراوەی کە دیەوێت لەسەری بوەستێت و دەڵێ: (. ئەم دەمەو بەیانەش. وەك هەر دەمەو بەیانێکی تر. نەوی‌یە گەسکەکەی و لەگەڵیدا هات و چو.) کابرای کارگوزار لەسەر کارەکەی بەردەوام دەبێت تا بە حیسابی خۆی کاشی‌یەکان لە پەڵەو لەککە پاك دەبنەوە ئەوجا دەوەستێتەوە، بەڵام کە بەڕێوەبەر دێتە ژوورەوە پەڵەیەکی بچووك سەرنجی رادەکێشێت، ئەوسا بە تەنها رستەیەکی کورت هەناسەی کابرای کارگوزار کورت دەکاو، راستی کەسایەتی خۆیشی ئاشکرا دەکات.

(ـ پاك کردنەوە وا دەبێت!).

ئەم شێوازە لە (خەلات)یش دا دووبارە بەکار براوەتەوە، ئەمیش سەرەتا بە کورتەی رووداوێکی رۆژانە دووبارەوە بوو دەست پێ‌دەکات: (رۆژانە پانایەکەی دامێنی گەرەکەکەی بەر پێ‌ی شار دەبێتە یاریگەی منداڵانی ئەو گەرەکەو، یاری‌یەکانیان لەوێرا دادەبەستن.) ئەوجا دەچێتە سەر ئەو رووداوە تایبەتی‌یەی کە بەو پیشەکی‌یە رێگای بەرجەستەکردنی بۆ خۆش دەکاو دەڵێ:

(. ئەم دەمەوئێوارەیە بۆ جارێکی دی منداڵانی ئەو کوچەو گەرەکە. (. . .) گەرەك بۆ هەنگاوەکانیان رادەخەن.

ئەمرۆ منداڵانی ئەو گەڕەکە باڵ بە هەنگاوەکانیان دەگرن. (. . .) بەوو هیوایەی هەریەکەیان لای خۆیە بیێتە خاوەنی ئەو جووتە پێڵاوە لاستیکەی گورچك پڕێکی گەرمك.) دەیکاتە خەڵاتی ئەو منداڵەی کە لە ڕاکردنەکەدا بە یەکەم دەردەچێت. ئەنجام منداڵێکی پێ خاوس دەیباتەوە و کابرای تەنگا ئەستوور جووتە پێڵاوە هەرزان بەهاکەی پێ دەبەخشێت، ئەویش بەوپەڕی خۆشی‌یەوە، هەر لەوێدا لەپێی هەڵدەکێشێت. ڕاستی‌یەك هەیە دەڵێ: پێویستی دایکی داهێنانە. ئەم چیرۆکە نموونەیەکی پراکتیکی ئەو ڕاستی‌یەیەو نەبوونی و پێویستی منداڵە هەژارێك بۆ وەدەست هێنانی جووتێ پێڵاو دەخاتە باڵ و بەسەر ئەو دوایی هاوڕێکانی‌دا سەری دەخات. . واتا نهێنی سەرکەوتنی منداڵە پێ‌خاوسەکە لە پێویستی‌یەکەی دایە. ئەمەش ئەنجامێکی ئاسایی‌و پەسەندەیە. ئەم شێوازی (کورت کردنەوە)یەی کە لە سەرەتای (پەڵە) و (خەڵات)یش دا بەکاربراوە، لە (تۆبڵێیت)دا بە شێوەیەکی بەرفرەوانتر بەکاربراوەتەوە، لێرەدا بۆ ڕێخۆش کردنی پێشکەش کردنی ڕووداوێکی دیاری‌کراوی کۆتایی زنجیرە ڕووداوێکی لێکچوو بەکار نەبراوەو بیرێتەوە، بەڵکو بووەتە شێوازی سەرەکی و هەموو ـ گێڕانەوەکەی ـ گرتۆتەوە. ڕووداوی (تۆبڵێیت؟!) حاڵەتێکی تایبەتی تێدا نی‌یە کۆتایی بە دووبارە بوونەوەی ڕووداوە ڕۆتینی‌یەکە بێنێت تاچیرۆك نووس لەسەری بوەستێت و لە دیمەنێکی زیندوودا بەرجەستەی بکات وەك لە (پەڵە) یا لە (خەڵات)دا کردوویەتی. بەکورتی ڕووداوی (تۆبڵێیت؟!) ڕەگەزی درامی تێدا نی‌یەو ماوەیەکی دوورو درێژ دەکێشێت و لە دوو کاتی لێك دابڕاو و دوو شوێنی جیا جیادا بێهوودە دووبارە دەبێتەوە.

ڕووداوەکە (ڕۆژگارێك پێش ئێستا) لە ژووری فەرمانگەیەکەوە دەست پێ دەکاو پاش (سێو چوارساڵ) دووبارە بوونەوە ئینجا (ئێستاش دووای تەمەنێك. . دابڕان) سەرهەڵدەداتەوەو، هێشتاش بەردەوامەو نەگەیوەتە ئەنجام. ڕووداوی وا بۆ بابەتی چیرۆکی زۆر کورت دەست نادات و ئەنجامی باش نابێت. لەبارترین ڕووداوی چیرۆکی زۆر کورت ڕووداوی کورت و سادە و بێ‌گرێ و گۆڵ و، لق وپۆپە. خاڵی هەرە نزیکی ـ لووتکە ـ ش خاڵی لەباری دەست پێکردنی گێڕانەوەکەیەتی چیرۆکی زۆر کورت، ڕێ خۆش کردنی پێشکەش کردن و، گەڕانەوەو بەسەر کردنەوەی هەڵوێستەکانی پێش ڕووداوەکە، هەڵناگرێت. لە (تۆبڵێیت؟!)دا ئەم سەرەتایانە ڕەچاو نەکراون، بۆیە کە دەیخوێنیەوە هەست بە ساردو سڕی‌و کەم تینی کارتێکردن و زاڵ بوونی ـ کات ـ ەکەی دەکەیت لەسەر حسێبی ئەو ڕەگەزەکانی دیکەی. چیرۆك نووس هەوڵێشی داوە بە بەکار بردنی شێوازی (کورت کردنەوە) کاریگەری ـ کات ـ ەکە کەم بکاتەوە، وەلێ لە هەقی نەهاتووە. ئەمە جگە لەوەشی کە (کورت کردنەوە) خۆشی شێوازێکی زۆر پەسەندە نی‌یە لە بواری چیرۆکی زۆر کورت دا.

شیاوی گوتنیشە، ئەم (چیرۆکی کورت کورت ـ short short story)ەی کەلە ئەدەبی کوردی‌دا (چیرۆکی زۆر کورت و، چیرۆکۆکە، کورتیلە چیرۆك و، پۆستەرە چیرۆك و، ڕۆژانە چیرۆك)یشی پێ‌دەگوترێت، بە دیاردەیەکی هاوچەرخی ئەدەبی تەماشا دەکرێت. بوون و پەرەسەندنیشی لە ئەدەبی کوردی سەردەم دا نیشانەیەکە لە نیشانەکانی زیندوویی و بەردەوامی ئەدەبەکەمان. شارەزایانی ئەدەب (ئەمەریکا) بە مەڵبەندی سەرهەڵدان و گەشەکردنی چیرۆکی کورت کورت دادەنێن، هۆی ئەوەش بە بەرتەسکی بواری بڵاوکردنەوەو، سەرقاڵی مرۆڤی هاوچەرخەوە دەبەستن، کە لەبەر هەڵپەی دابین کردنی پێویستی‌یەکانی ژیان نایان پەرژێتە سەر خوێندنەوەی کاری ئەدەبی دوورو درێژ. ئەمە ڕەنگە بۆ دووبارە بووژانەوەی چیرۆکی کورت کورت ڕاست بێت، بەڵام چیرۆکی کورت کورت خۆی لە خۆی‌دا چالاکی‌یەکی مرۆڤانەی دێرینەیەو ڕەنگەهەر لە دوای پەیدابوونی شیعریشەوە سەری هەڵدابێت.

فۆلکلۆرو، کەلەپوری هەر نەتەوەیەك بپشکنیت بە دەیان چیرۆکۆکەی تێدا دەدۆزیەوە کە مرۆڤی سەردەمەکانی پێشوو فەلسەفەو، بیروبۆچوون و، ئەزموونەکانی ژیانی خۆیانیان تێدا بەرجەستە کردووە. وەك چیرۆکەکانی ئیزۆپ، یاوەك ئەو چیرۆکۆکانەی کە لە پەشت زۆربەی پەندە کوردی‌یەکانەوەن.

دەتوانین بڵێین ئەم چیرۆکە کورت کورتەی ئێستا وەچەی هاوچەرخی ئەو جۆرە چیرۆکەن. ئەگەرچی جیاوازیشیان هەیە ـ هەرچەندە لێکچوونیشیان زۆرترە ـ ئەوە دەگەڕێتەوە بۆ جیاوازی بارو سەردەم ـ بە کورتی، چیرۆکی کورت تەواو نوێ‌و نامۆ نی‌یەو لەکەلەپوری کوردەواری‌دا بنج و بنەوانی هەیە. بایەخ پێدان و بووژاندنەوەی پێویستە.

ژێدەرەکان:


١ ـ میشال بوتور: بحوث في الرواية الجديد / ت: فريد انطونيوس / بيروت ـ ١٩٧١.

٢ ـ رولان بارت: درجة الصفر للكتابة / ت: محمد برّاده / بيروت ـ ١٩٨١.

٣ ـ د. موريس ابو ناضر: الالسنية والنقد الادبي / بيروت ـ ١٩٧٩.

٤ ـ سمير المرزوقى و جميل شاكر: مدخل الى نظرية القصة / بغداد ـ ١٩٨٦.

٥ ـ د.. عدنان خالد عبدالله: النقد التطبيقى التحليل / بغداد ـ ١٩٦٨.

٦ ـ فن كتابة الاقصوصة: مجموعة من الكتاب / ت: كاظم سعدالدين / بغداد ـ ١٩٧٨.


**٨ی ئاب**
**ڕۆژی خۆشیی عیراقە**

# ئەی وەرگێڕ.. ئەی داهێنەر!

● مولود ابراهیم حسن ●

ئەمڕۆ کتێبخانەی کوردی هێندەی کتێبی نایاب تێدایە کە خوێندەواری کورد، بە شادی و حەزەوە دەستی بۆ ببات و لە دەست و ڕاحەتی خۆی پەشیمان نەبێ، چون نە خوێندنەوەیان حەرجی دەکات. چ نە دانراو و کۆکراوە؟ چ نە ئامادەکردن و وەرگێران. **بۆیە تازەکارێکی کە لێرە بیەوە ئارەزووی خوێندنەوەی** هەبێ، دەتوانێ نە کتێبخانەی کوردی‌یەوە دەست پێ بکات و بە زمانی خۆی بخوێنێتەوە و هەتا ڕاددەیەکیش پەکی نەکەوێ!! جگە نە دیوانە شیعر و کۆمەڵە چیرۆك و شانۆگەری‌یە چاپ کراوەکان، کە ئەمانەو زۆری تریش لەم چەند ساڵانەی ئەم دوایی‌یەی ئەم سەدەیە! چاپ و بڵاوکراونەتەوە، ئەوە هەندێ شاکار هەن لە نێو کتێبخانەی کوردی، کە بەرهەمی کەسانی دڵسۆز و لێهاتوو، نووسراون و ئامادەکراون و وەرگێڕدراون، **داهێنەرەکانیش** کەرەکان بە ناوی خاوەنەکانیانەوە لکاون. کە پیاو ناتوانێ بە خەیاڵیش بیری کەسیکی تریان لێ بکاتەوە، ئەوزاتانە.. هەر دەڵێی: بۆ ئەوە هاتوونەتە ژیان کە ئەم کارە پیرۆزانە بکەن. کە واچاکە بۆ نموونە ناوی هەندێکیان لێرە بنووسین. (مێژووی ئەدەبی کوردی) و مامۆستا علاءالدین سجادی. (تێکەیشتنی ڕاستی) و ئامادەکردن و لێکۆڵینەوەی دکتۆر کەمال مەزهەر. (کورد لە مێژووی دراوسێکاندا) و وەرگێران و پەراوێز بۆکردنی مامۆستا سەعید ناکام. (داغستانی من) و وەرگێرانی مامۆستا عەزیزگەردی زۆر و زۆری تریش، سەرەرای ئەمانە هەموویان وەرگێران و کارە پیرۆزەکانی مامۆستا مەلا شکوری بەرێز و خۆشەویست. کە ئێمە لەم نووسینە دەمانەوێ بە تایبەت باسی بەشی دووەمی ئەودیوی چیا بکەین، کە لەم دوای‌یەدا کەوتە بازاڕ و کتێبخانەی کوردی بە شاکارێکی تر ئاوەدان کردەوە.

من کە بەم دوایی‌یە لە خوێندنەوەی بەشی دووەمی ئەو دیوی چیا واتە ـ زەوی ئاسن و ئاسمانی مس ـ بوومەوە، هاتمە سەر ئەو ڕایەی کە: ئەگەر نووسەرێك: جارێك سوپاسی ئەو وەرگێڕە بکات کە نووسراوەکەی وەر دەگێڕتە سەر زمانێکی دی، ئەوا (یەشار کەمال) دەبێ سێ جاران منەت باری لالۆ شکور بێ، یەکەم: لە بەر ئەوەی کە وەری گێڕاوە. دووەم: لە بەر ئەوەی چاکی وەرگێڕاوە. سێیەم: لە بەر ئەوەی وەری گێڕاوەتە سەر زمانی کوردی. ئەوا خوێندەوارێکیش: ئەگەر یەکجار شاکارێکی ئەدەبی بخوێنێتەوە، بۆ ئەوەی بزانێ، چۆن نووسراوە و چی تێدا نووسراوە. ئەوا دەبێ خوێندەواری کورد سێ جاران: ـ ئەودیوی چیا ـ بخوێنێتەوە. یەکەم: لە بەر ئەوەی شاکارێکی بەرز دەخوێنێتەوە. دووەم: لە بەر ئەوەی لەم شاکارە باسی خۆی دەخوێنێتەوە.

سێیەم: لە بەر ئەو وەرگێرانێکی پاراو بە زمانی کوردی دەخوێنێتەوە.

وەرگێران.. وەرگێرانی سەرکەوتوو، ئەویش بۆ خۆی داهێنانە. ئەگەر وا نە بوایە، دەبوو هەموو ئەو قوتابی‌یانەی ساڵانە لە بەشی وەرگێران و زمانە بیانی‌یەکاندا دەخوێنن، ببن بە وەرگێر!! بە پێچەوانەوە وەرگێرانیش هیچی لە کارە ئەدەبی‌یەکانی دی کەمتر نی‌یە! ئەگەر گرانتر نەبێ! هەر بۆیێش وەرگێری داهێنەر لەنێو هەموو زمانەکاندا، ژمارەیان بە ڕێژەی ژمارەی تەواوای وەرگێران. ژمارەیان کەمە. لالۆ شکور لەم کارانەی دا، زۆر لێزان و دەوڵەمەندانە ئەم نووسینانەی ـ یەشار کەمال ـ ی کردووە بە کوردی، چۆن شوانی ئاشق لە مێرگی تازە بەهاری، چەپکە گوڵی دیاری لە نێو هەموو گوڵە بەهاری و جوانەکانی کوردستان هەڵدەبژێری و عاشقانە بۆ خۆشەویستەکەی دەچنێ. لالۆش ئاوا لە نێو زاراوە کوردی‌یەکاندا خامەی گێراوە، لە باکورەوە بۆ باشوور، لە ڕۆژ هەڵاتەوە بۆ ڕۆژ ئاوا. لە شارەوە بۆ لادێ. لە حوجرەوە بۆ

زانکـو، نه شیعـرەوە بو پەخشـان. نه فولکلورەوە بو داهینان له کوبەوە بو نوسی (کورتن) له له هەرکەری کونیکی جوانی دیبی بوی چووەو ـ ـ ی ـ یانـە جوی کردوتـه حاکمی زور موکان. زور لیـزان و جەسـوورانـە، زور عاشقـانـەو دلسوزانە. ومه لیـدیـوم دەستەواژەو رستەو پەندو شیعری لیك دووری هینـاوە کن یەك و فەرشی وەرگیـرانـەکـەی هینـدەی تـر جوان ودلگـرو عاشقانه تر کردووه. لالو عاشقانه، عاشقیش له سەر قسەی ـ بابه تایەر ـ له کەس ناترسی، چونکه

**(هیـچ شتی هیندەی ترسنوکی بەرەی ئینسانی ئیکجار وا سەر شور نەکردوە تا ئیستا) ل**

بەلی لالـوش عاشقـانـەو نه ترسـانه، له نیو فەرهەنگی کەوزەی کورد! نەو فەرهەنگەی به هەزاران ساله (حوسرو سوفی و مریەمرك و خەلـیلەپیـرو. .) کی وکی، نەو دەست، تەو دەست و نەیدن. نەو دل و تەو سەر، نەو سەری پی دەکـەن و نه چاوی خویـان چاکتـر دەپیـاریـزن. تەوفەرهـەنگـەی پرە له وشـەو دەستـه واژەی مروڤ دوسـتی و میـوان دوستی و سروشت دوستی!! پرە له حرپـەی دلی عاشق و نەعـرەتـەی شورە سواران، پرە له جریتی مزرو قسـەی به تویکل. . پرەو. . پرەو. . پر!!

تەوەتـە له باشـووری کوردستـانـەوە، له فەرهـەنگی خانی و جزیری، له قەلای عەبدال خانەوە. گول تیری! (بابزنین بنەمالەی تاشباش نیرو چی یان کردووه؟ ئەز دخوازم چننەکی ژتە بیر سەر) ل گول تیـری و بەرەو خوارەوە شور دەبیتـەوە، توك و دوعـایی دەکات: **(ئەی سپه باوکەهار بوگه. هەی بەگـاو گەردوون تیرەو رەگـە ماکەی وی. ئەگەرەکە ئەو پیـاو بووگایه، ئەی ئاوایی یه وەی تەورە، نه ئەرەسیا)ل**

بەلی: ئەگـەر پیـاو بوایـه ئەم ئاوایی یـه وای به سەر نەدەهات: بەلام! لالـوم: لی ناگـەری وەرگیـرانـەکـەی ئەووەك ئاوایی کابـرای لی بەسـەر بی!! ئەمجـاره روو له دەشتی هەولیـر دەکـات و زوّر جوان و سەرکەوتوانه، پی ی دەلی: (بچو. . لو ناچی؟) ل[١٠] نەکەی **(خەونەکه لوکەس بگیریتەوە) ل**[٣١] **بی ترس و شەرم «لو» بەکار دینی.**

**هونـەری وەرگیـران و زمانزانی و شاعیرانەی لالو شکور، هەر بەوە ناوەستی، زاراوە کوردی یـەکان له ناویەك وەرگیرانه کوبکـاتـەوە، بەلکـه ئەم هونـەری وەرگیـرانـەی هینده تیرە، دەگـاتـه لاپەرترین وشەو سەیر ترین نیدیوم.** وادەکات یەشار وەکـو خوی زور جار به کوردی پاسـەوانه کانی دەدوینی. لا.. **فیری شیعری فولکلور به کار هینا نیسی دەکات.** (نوهوهـ. **لیــدە له حەوشی گەورە. یـاپـراخـەر دونکی چەوورە)** ب ئەگەر دونکی چەوریاپراخی چەور کردووە، بابزانین شکە بزن چی دەکـات؟: (کەوزە کەحر، هەی دروزن، دروزنی کـلکـه بزن) ب . . نابی ی: یەتمـاز باسی کلکـه بزی کردبی؟ گرنگ نی یه. نەوە داهینانه، داهینانی وەرگیر.

دیسـان مامـوستـا له نیـو فەرهـەنگی زمـانی کوردی دەسـوریتـەوە، نەك هەر تەنهـا وشـەی به زمـانی کوردی. سەیرکـه دەنـووسی: **(بـه عیبادە لیەشەری نالیم)** که ئەمه له عەرەبیەوە هاتوونه نیو زمانی کوردی. یان دەنووسی: **(بیلبتور ـ نالەویـر)** که ئەمـانـەش له تورکی یەوە هاتـوون. هەروەهـا دەنـووسی: **(نـەفراندەیکی)** که ئەمەش ئەچیتەوە سەر زمانی فارسی. یا دەنـووسی: **(دومـوخـرات دیمـاـر سی)** که له لاتینی یەوە هاتووە.

بەلی: مامـوستـا شکـور چاك دەزانی. فەرهـەنگی زمـانی کوردی، زور له فەرهـەنـگـی وشـەی به زمـانی کورد دەولـەمـەنـدترە. ئەمـەش عەیب نی یـەو حالی هەموو زمـانی دنیـاش هەروایـه. زمـانیکیش ئەگەر نەکرو نەفروش بی دیارە دەردی مرن نی ی یه.

دیسـان بەکـارهینـانـی زور وشـەو ئیـدیـومی تـر، هەمووی نیشـانـەی زمـان دەولـەندی و دەست رەنگینی لالو شکورە. بو نمـوونـه: **لەحنـەت، حەلی، مەمیـدیـك، هەرتکمـان، کیروشك، هیلون، بەگەن، دەو.**

**نەینك، زلحیز، نەمگوتنی.** کەئەمانه سەر بچریکه له میر خوزاریك.

ئەگـەر تا ئیستـا له گەل داهیـنی وەرگیرانی ماموستا شکور دابـووین، با ئیستـاش قسـەیـەك له داهینانی ـ یەشار کەمال ـ ی. نووسـەربکەین، یەشار کەمال لەو نووسەرانەیه، پالەوانی زوری بەرهـەمـه کانی، لادیی و نەخـویندەوارو هەژارن. که ئەمـەش واقعی ژیـانی گونـدنشینـەکانی ولاتەکەیەتی. ئەو به زوری باس کەسـانیـك دەکـات. که دوور له روژگاری ئەمرو دەژین: خەلکی گونـدە دوورەکـانن، گونده دوور کانی چیایه دوورەکان، چیایه دوورەکانی ژیر بەفرو له دنیا دوورەکان. ئەو

بەفـرەی، هەزاران ساڵـە بەستـو یەتی و نەتـواوەتـەوە. ئەو پاڵـەوانـانـەی نووسینـەکـانی یەشـار ـ یاراستـر، ئەو مرۆڤـە هەژارانـە، لەوی، کـەوتونـەتە ململانێ یەکی بەردەوام و هەمە لایەنە، ململانێ لە گەڵ زاتی خۆیان. کەسانی گوندەکەیان، لەگـەڵ بازرگـان و پۆلیس، لەگـەڵ دەوڵـەت و دنیـا، لە گەڵ سروشت و واقـع، لەگـەڵ زانست و ئەفسانە. لەنێوان مردن و ژیـان دان. بە نا چاری دەبن، یا ڕاستتـر دەگرین، بە وەلی، بە دەروێش، بە ئەشقیـا: **(جا وەرە وەلی‌یش بەو ئەشقیـاش بە، وەی دایـە وەی! لەم سەر چیـاو گەژانـە، نەك حكـومەتی كۆمـاری توركیـا، دەوڵـەتی گەورەو گرانی ئامریكایش، بێتە سەری چی بێ لە گەڵ ناكـرێ)** [٢٢٣]، جا چی بێ لە گەڵ بکـرێ، کەسـانێـك پشت بە هێـزی خۆی، هێـزی مرۆڤ ببەستێ، بە چاکەتێکی کۆن و شەڵوارێکی دڕاو

یەشـار کەمـاڵ ئەو دێ‌یـە چکـۆلـەو هەژارو لاپـەڕو دوورە شارەی هێندە ئاوەدان وپڕ جمکو جۆڵ کردووە، کە پیاو نازانێ لە ژێـر ئەم خانـووە قوڕو بەفرە ئەستوورە، ئەم هەموو خوێن و هیوایە لە کوێ دێ؟ هەمووڕق و عەشقە چۆن پەیدا بووە؟ ئەم هەموو شەڕو پێك هاتنەوە چۆن ڕوو دەدا؟

کوڕە وەرە مەمـرە!! بەهـار بەهـاری خرایی، ئەو بەهـارەی هەرچـی کۆنی لە زاری دایــە پێ‌یدا هەر دەڵێ! هەرچی زی ڕوحــە خۆشی دەوێ! کەچی لە خەڵکی گونـدی کوڕی سەر بەڕوی ـ تاشباش ئۆغلو ـ بویتە مەرگەمووش، دەترسین! بەهار بێت! بەهـار. ئاخـر! چۆن نەتـرسین؟ کە بەهار هات ـ ئارد ـ دەبـڕێ، کە ئارد بڕا، برسـی‌یـەتی، مەرگ سەر بە ماڵیـان دادەگـرێ!! پیـاو دەبـرسی؟ ئەو خاکــە سەروبن پڕ خێـرو بەرەکـەتـە، بۆچی ناتـوانێ؟ ئەم هەژارانـە تێـرکـات؟! ئەو هەژارانــەی، کە ئەگـەر، شووربـایـەکی گەرم یان ساوارێکی چەوور ڕۆژ یـێك تێـریـان بکـات! ئەو ڕۆژەیـان جێـژنـە!! ئەو جێـژنانەش کەم ڕوو دەدەن. سەرەڕای لە بەهار ترسانێ، ئەوا ئەم ساڵ ترسی هاتنی (عـادیـل)یش ی هاتـووتـە سەری!! عادیل ئەگەر بێت، دەرپێ ی ژنەکانیشیان دەبات!! وای لە بەر دەردی عادیل هاتنی، وای لە دەردی برسی‌یەتی؟!

لە کۆتـایـدا چەنـد تێبینی‌یـەکی چکـۆلـەم هەیـە، لە دڵی خۆمیـان ناکـەمـە مەرەق و بەرووی مامـۆستای خۆشەویستیدا هەڵـدێنم: هەر چەنـدە بەنسبـەت کارە پیـرۆزەکـانی مامۆستا شتێـك نین لە چاو ئەم هەمـوو هونـەرکـاری‌یـەی وەرگێـرانەکـانی‌دا، حسـابیـان بۆ بکـرێ، بەڵام من لەبـەر ئەشق و خۆشـەویستی وەرگمێـرانەکانی مامۆستا، نەمویست بێ دەنگ بم، هەر چەنــدە زۆریش دەنگم نەڕواوپشت قایمیش نەبم، کە هیوادارم مامۆستا لێمان دڵگران نەبێ.

تێبینی‌یەکان:

١ ـ لەوەنـدەی کە من نووسینی یەشـار کەمالم خوێندوتەوە. لە هەر جێگایەك باسی ـ چقورئۆوا ـ هاتبێ من بە ـ چقورئاوا ـ ی تێگـەیشتـووم، جا بۆیی حەزم دەکـرد مامـۆستـا شکـرر هەر چقـورئـاوای نووسیبـا لە جیاتی ـ چقور ـ ئۆ ـ وا ـ کە گۆکردن و خوێندنەوەی کەمێك لەزار گرانە.

٢ ـ لالـۆ شکــور لە چەنـد جێگـایـەك لە وەرگێـرانـەکـانی‌دا **(زریکـانـدی)** بۆ پیاو بەکار هێناوە، کە من هەندێ پێ بزانم، ئەم زریکاندنە تایبەتە بە ژن. چۆن مامۆستا خۆشی لە هەندێ جێگا هەر لەم وەرگێرانانەی بۆ ئافرەتیشی بەکار هێناوە.

٣ ـ مامـۆستـا شکـور لە زۆر جێگـای بەرگی دووەم، لە کاتی دوانی کەســەکـان، تەواوی قسـەی کابـرا دەنـووسێ، جا لە کۆتـاییـدا: دادەنێ کە ئەم یاسـایـەو دەستـوورە لەگـەڵ زمانی کوردی نەشـاز دێ، ئەگەر خوێندەوار بە وردی سەرنجی بداتێ هەستی پێ دەکـات، جار واهـەیـە ئەم «گـوتی»یـە بەم شێـوە نووسینـە لە شوێنی خۆی دەبچـڕێ‌و دەبێتـە هی ئەوکـەسـەی کە باشتر دەدوێ.

٤ ـ مامـۆستـا شکور دەبوایە **(یا هەرە یا نەرە)** ل [٣٩٢] کە یەشار هەر ئەوهـای نووسیـوە لە نێـو دەقەکەدا وەکو خۆی هێشتباو، ل پەراوێـزدا شەرحی دابـا، کە بەلای من، بو وەرگێرانی کوردی مانا لێکدانەوەی نەدەویست ئەگەر هەر دەشی کرد، بەڕای من واچـاك بوو نووسیبـای (یـان برۆیان مەرۆ) کە ئەم (یـا هەرە یا نەرە) نە دەقەکەیە، نە وەرگێرانەکەی ئێرە.

ئیتـر لە کۆتـاییـدا هیـوای تەمـەن درێژ ی‌و لەش ساغی‌و پڕ بەرهـەمی من بۆ مامـۆستـای خۆشەویست وەرگێری بەتواناولێ ـ هاتـوو و کوردی زانی بەڕاستی مامـۆستـا شکـور دەخوازم، لە پێناوی خزمەت بە ئەدەبی کوردی.

* تەمـەشـای: ـ ئەو دیـوی چیـا ـ بکـە، لە نووسینی ـ یەشـار کەمال ـو وەرگێرانی لە تورکی‌یەوە شوکور مستەفا ـ چاپی بەغدا ساڵی ١٩٨٧

# توانج وپلار
# یا تەنگوچەڵەمەی چیرۆك وچیرۆكنوس

كاوە توفیق پێنجوێنی

ماموستا غفور صالح ی چیروكنوس لە پاشكوی عیراقی ژمارە (٧٤)و (٧٥) نوسینێكی خێرای لەسـەر ژمـارە تایبـەتی‌یەكەی گوڤاری بەیان بلاوكردبووەوە، ببورن كە ئەڵێم نوسین و ناڵێم رەخنـە چونكـە رەخنە شتێكی‌ترەو ئەو نوسینەی كاك غفور صالح لە (تۆپەڵە قرأتی) ئەچوو یان هەر وەكو خووی بە (رای) بەپەلەوە گرتبێ وابوو وەك شەویكیان لەبەرنامەكەی كاك محمـد عبدالرحمن زەنگنەوە چاوپێكەوتنی لەگەڵدا كراو كومەڵێ راو تەصریحی پەلەی دا لێرەشدا هەر وای لێ بەسەرهاتووەتەوە .

ئەوەی من ئەمەوێ بیڵێم تەنها رەت كردنەوەی ئەو تۆپەڵە نوسینەی كاكی رەخنـەتـاشـەو بەس چونكـە ئەوە ئیشی من نی‌یـەو ئیشی رەخنەگرێكی بە ئینصافە بێت لەسەر تێكرا چیرۆكەكانی بەیانی ژمارە (١٤٠٨) وئەو تەصریحانەی كاك غفور بدوێ كە وابزانم پەرەو دوو پەرە لە رۆژنامە پەرە حەسیری‌یەكان دادی نادا بەهەر حاڵ با ئەوەی ئەمەوێ بیڵێم . یەكەم چیرۆكی (دیدەنی) ماموستای بە تواناو خاوەن تەجروبە ماموستا (مصطفی صالح كریم)ە كە ئەم چیرۆكە كەم كەس هەیـە بیری چیرۆكەكەی نەبیستبێ بێ‌وەفایی و بەدنمەكی‌و سپلەیی هەنـدێ هەل پەرسـت و دوو روو و رووخـاوو تاقـمـی ئەشەهەدوو‌بیلای ناهەق وێنە ئەگرێ‌و ماموستا بەگوێرەی لێ هاتوویی خوی هاتـووە ئەم بیرەی قوستـووەتـەوەو هونەرمەندانە لەو چیرۆكە داڕیشتووەو گیانی چیرۆكێكی كوردی كردووە بەبەردا بەلام وەك كاك غفـور بوی چووەو ئەڵێ گوایـە لە چیرۆكێكی عبدالخالق‌ركابی وەرگیراوەو ئەو نمونانەیشی هێناویەتی‌یەوە فری بەو لێكچونەوە نی‌یە .

نازانـم بوچی ئەبێ ماموستـا غفـور صالـح كەوتبێتـە ئەو هەناسەسواری‌یەو بڵێ چیرۆكی فلانە چیرۆكنوسی عیراقی‌یەو بو ئەبێ ئاوها تێ‌بگا ئینجا منیش لێرەوە لێی ئەپرسم ئەی ئەبێ بیرێكی وا

بلاو عبدالخالق ركابی له كێی وەرگرتبێ، جگه لەوە ئەویش هاتووە بەگوێرەی بیری خۆیو لێهاتوویی خۆی بیری چیرۆكەكەی بەو شێوەیەی ویستوویەتی ڤۆستوویەتەوە، خۆ ئەو بیرە بلاوەش كه لەو چیرۆكەدا هەیە هەر تایبەت نی‌یە بە عێراق و بەس بەڵكو لەهەر كەلەبەرێكی ئەم دنیایەدا سەیر بكەیت خالی نی‌یە لەو بێ‌وەفایی‌و خۆلێ گۆڕان و لووت بەرزی‌یە كە لە چیرۆكەكەی مامۆستا مصطفی صالحدا هەیە، بە كاك غفور ئەڵێم بۆ ئەبێ لای جەنابتان كاری خۆماڵی وا سووك بێت.. ئینجا وەك بیرخستنەوەیەك بیری ئەخەمەوە پێی ئەڵێم ئەی ئەبێ (پێشوازی خاوەن شكۆ) كە دوو چیرۆك نووسی پێشڕەو لێهاتوو نووسیوویانە ئەبێ كامیان لەوی تریانی وەرگرتبێ یان ئەمانیش هەریەكە بە گوێرەی لێهاتوویی خۆی مامەڵەی لەگەڵ شتەكاندا كردووە، ئیتر بۆ ئەبێ ئەمانە هەمووی لای كاكی ڕەخنەتاش دیزە بە دەرخۆنە بكرێ..

دووەم چیرۆكی (هاوار)ی مامۆستا (احمد محمد اسماعیل) كه یەكێكە لە چیرۆكە دیارو سەركەوتووەكانی ژمارە تایبەتی‌یەكە، كاك غفور هەر بە زۆر سوار سەری ئەو چیرۆكەیش بووەو ئەڵێ (نەی زانیوە یان نەیتوانیوە ڕەمزەكان تەوزیف بكات و دووبارە بوونەوەی ڕەمزەكانی چیرۆكی (ئەسپ)ە ئەگەر بە ئینصافەوە بڕوانینە ئەو ڕایەی كاك غفور صالح ئەزانین كەوا نی‌یەو هەر لە چەواشەكردنی خوێنەر تێ‌پەڕ ناكا ئەگینا بۆچی نموونەیەكی باوەڕپێكراوی نەنووسی‌و نەیهێنایەوە كە خوێنەر قەناعەت پێ بكات، وا دیارە كاك غفور هەر دیوی دەرەوەی چیرۆكی مەبەستەو بەس.

ئەوەندە توند ڕەوە لەو ڕایانەش هەر لەكابرای ناو چاڵەكە دەچێت كە لە ئەنجامی ئەوەی (ویستی قەڵەم بازێك بداو ئەوەندەی خۆش بوو خۆی هەڵدا ئیتر خۆی لەچاڵەكەدا بینی‌یەوە). بەلام كاك غفور نایەوێ بڵێت لە چاڵەكەدام بەڵكو دەڵێ هەموو چیرۆكنووسان لەو چاڵەدان و سەرەكەیشی گیراوەو ئەزمەی چیرۆكنوسان لەوەدا سەر هەڵ ئەدا..

سێیەم چیرۆكی (سەرچاوە)ی سەلام مەنمی زمان پاراوو ڕەسەنە كە سەركەوتوانە لەگەڵ پاڵەوانی چیرۆكەكەی‌و بارو دۆخی سەردەمە بەردەوامەكەی چیرۆكەكەیدا مامەڵەیەكی ڕاستگۆیانەی كردوەو بێ سەر لە خۆ تێكدان و بەستنەوەی بە پاڵەوانی چیرۆكە جیهانی‌یەكان تایبەتی بیژن چیرۆكەكە بووەتە جیهانی، كەچی كاكی ڕەخنەتاش لە سەرەتاوە بە پاڵەوانی چیرۆكەكە دەڵێ (خۆیشی نازانێ ئەو كارەی بۆ هەڵبژاردووە) لێرەدا بە دڵێكی پاكەوە لە هەموو ئەو كەسانەی چیرۆكی (سەرچاوە) یان خوێندووەتە ئەپرسم و ئەڵێم ئەمە وایە؟! لەو بڕوایەدام ئەوەی دۆستی چیرۆكەو لەو چیرۆكەش بگات لەو سەری‌یەوە دێتەوە؟ ئینجا لە مامۆستا غفور صالح ئەپرسم كە مەبەستت نرخاندن و هەق دان بوو بە چیرۆكەكان بۆچی بیری چیرۆكەكەت باس نەكردبوو یان هەر ئەوەندەتان مەبەست بوو؟ وابزانم ئەبێ كاك غفور صالح لەگەڵ ئەو چیرۆكانەدا دانووی نەكوڵێ..!

یان لەكۆتایی‌دا ئەڵێ سەلام مەنمی وەسفی كچەكە ئەكات و ئەڵێ(وەك مانگ خەرمانەی داوە) كەچی مامۆستا غفور صالح ئەڵێ فۆلكلۆرە هەتا ئێستاش نازانم بۆ ئەبێ مامۆستا غفور جیاوازی نەكردبێ لە نێوان فولكلۆر وێنەی ئەدەبی دا ئیتر بۆچی ئەبێ یەكێك ئەوەندە دەستەوەستان بێت لە زمانی نەتەوەكەیدا چۆن دەست ئەبات بۆ كاری وا گەورە هیچ نەبێ ئەچێت لە حوجرەی زمان زانێكدا فێری زمان ئەبێت و ئەنجا دێت دەست ئەداتە ئەو كارە. لەم سوچەیشەوە بیری ڕەخنەتاشەكەمان دەخەمەوە كەس ئەو هەقەی نی‌یە بە جەنابتان بڵێ مەبنە ڕەخنەگر یا واز لە چیرۆك بێنەو خەریكی بابەتی ئەدەبی هەرە تازەبە، وەك كاك غفور بە مامۆستا سەلام ئەڵێ با خەریكی فۆلكلۆر بێت نازانم چۆن ئەو هەقەی بە خۆیدا..

چوارەم چیرۆكی (گوڵەو برایمۆك)ی مامۆستا (محمد رشید فتاح)ی چیرۆكنوسە كە ڕەخنەتاش هاتووە میرم كوتەكی ئەڵێ (بەكارهێنانی ئەفسانەیەكی میللی یان داستانێكی نەتەوایەتی ئەبێتە هۆی سەرنەكەوتنی كورتە چیرۆك و ئەوە بەكارهێنانیان بابەتی ڕۆمانە) لێرەدا هەر ئەوەندە بەسە كە ڕەخنەتاش بیژم بچۆ بیلوگرافیایەكی چیرۆكی كوردی‌و عەرەبی‌و جیهانی‌یەكانیش بكە بزانە تا چەندە ئەفسانەو داستانیان تیا بەكارهاتووە..

نەك وەك كاك غفور صالح ئەڵێ من و یەشار كەمال بەكارمان هێناوە ئەمەیان وەك ئەوە وایە كابرایەك وتی خەنجەر لەدوو كەس دیت یەكەمیان فلانە كەس و دووەمیان با پیاو باسی خۆی نەكات. بەهەر

حاڵ کاك غفور وائەزانێ هەر چیرۆکێك ناوەکەی یا ڕوویەکی فۆلکلۆر بوون یان داستان ئامێز خۆی پشان دا ئیتر کتومت ئەفسانەیە یا بە چیرۆکێکی فۆلکلۆری لەقەڵەم ئەدا، نەخێرو هەزار نەخێر وەکو مەسەلەی (لا تقربوا الصلاة)ەکەی لێهاتووە ئەگینا بۆ نەڵێن داهێنانە یان کاری خۆماڵی بە داهێنان نازانن!

پێنجەم چیرۆکی (ئارەزووی)ی ماموستا ڕەئوف بێگەرد کە بە زمانێکی پاراوو هونەریانە داڕێژراوە کەچی کاك غفور صالح ئەڵێ ئەم جۆرە چیرۆکـانە پەتایە و ئەیداتە پاڵ (گرێی ئۆدیب) لێرەدا هەقمە لێی بپرسم بۆ ئەو دەمـەی (ئـازە)و (دەستەو یەخە) چاپ کراو کەوتە بازارەوە بۆ پەتا نەبوو بەسەر ناوەندە ئەدەبییەکەوە یان ئەبێ ئیـستا باری ناوەندە ئەدەبییەکە هێجگار لاواز بێت بەرگەی هیچ گەرمیو ساردییـەك نەگـرێت و تووشی باپـەری بکـات، یان کاك غفـور لەسـەنگـەری ڕەخنـۆکـە نووسێکی ترەوە قسـە ئەکات کە ئەیووت پێـویستـیان بە وەرگـێڕانی ملوانکـەی ئەڵماس) نییە هەر لەبەر ئەو هۆیەی کاك غفور، بەهەرحاڵ با ئەمانە هەمووی بەجێ بهێڵم و بە کاك غفـور بڵێم ئەی ئەو نوسینەی لە هاوکاریدا بڵاوکرابووەوە بە نلوی (من و قەڵەم)ە کەم پەتا نییە بۆ ئەمەو دوا؟!..

شەشەم چیرۆکی (خۆرکەوتن)ی ماموستا (محمد فریق حسن)ە کە یەکێکە لە چیرۆکە دەرەوشاوەکانی ناو گۆڤارەکەو شوێنێکی دیاری هەیە لەناو کۆمەڵە چیرۆکەکەدا کەچی کاك غفور صالح ویستوویەتی ئەوەشی لەدەست دەرنەچێت و لەکۆتایی نووسینەکەیدا سەرو پۆلاکی شکاندووەو بەڵام بە ئینصافەوە، ئەم کارەی کاك غفور وەك ئەوە وایە ڕەخنەگرێك ساڵانی ١٩٧٦ ـ ١٩٧٨ پەیدابوو بوو ئەیووت باگۆران وای ئەنـوسیـایەو ئاوهای بنووسیایە یان با حمە صالح دیلان وای نەنووسیایەو وای ئەووتایەو ئاوهای بووتایە لێرەشدا کاك غفور ئاوهای لێ بەسەر هاتووە چونکە ئەڵێ با سەربازەکان بەزمانی هەلەق و بەلەق قسـان بکەن یان با ئاماژەی بۆ بکردایە لێرەدا ئەبێ کاك غفور ئەوەی بزانیایە کە ئەوە تەنها لە دەست چیرۆکنوسدایەو چیرۆکنوسیش خۆی زیاتر سەلیقەی پێ ئەشکێ.

حەوتـەم چیرۆکی (کـۆتـرە سپی‌یـەکە)ی ماموستا (عبدالله عزیز ئاگرین)ە کە کاکی ڕەخنـەتاش لای خۆیەوە دایناوە بە چیرۆکێکی سەرکەوتووی بێ خەوش و ئەڵێ لەو چیرۆکانەن کە هێماو ڕەمزە بۆ چەوسـانـدنـەوەو تێکـۆشـان و کۆڵنـەدانی مرۆڤ و گەشبینی‌یـەك و دڵنەوایی‌یەك بە مرۆڤ ئەدا.

ئەمە حەقێکی تەواوە بە چیرۆکەکەی داوەو وا بزانم تەنها دانی خێری بەو چیرۆکـەدا ناوە بەڵام ئەوەی لەبیر چووە کە ماموستـا عبدالله ئاگرین) یەکـەم کەس نییـە کە هێلانەی کۆترو بێچوە گورگی لە خزمەتی جەوهەری چیرۆکەکەیدا بەکارهێناوە بەڵام تەنها گورك کراوە بە بێچـوگـورگ و کۆتـریش بە هێـلانە کۆتر ئەویش لەبەر شیاوی جێگـاکەی بووە، لێرەدا لە ماموستا غفور ئەپرسم ئەی ئەو دووانە (گـورك و کۆتـر) ڕەمـزێکی بڵاو نین لە شیعـرو چیرۆك و کارە ئەدەبی‌یەکانی تردا نەك لەناو کوردا بەڵکو لە هەموو جیهاندا ئەی خوانەخواستە ئەبێ کێ ئەو حەقەی هەبێ بڵێ ماموستا عبدالله ئاگرین لەفـلان چیرۆکنـوسی وەرگـرتـووە یان دووبـارە بوونـەوەی ڕەمزی چیرۆکی یەکێکی‌تـرە وەك کاك (غفور) پێشتر بە بیری چیرۆکەکەی ماموستا (مصطفی صالح) دەڵێ لە (ڕکابی) وەرگرتووەو بە ماموستا (احمـد محمـد اسماعیـل)یش دەڵێ دووبـارە بوونەوەی ڕەمزەکانی چیرۆکی (ئەسپ)ە.

لە کۆتـاییـدا حەز ئەکەم ماموستا غفور صالحی چیرۆکنوس دڵ گران نەبێت و ئەم چەند دێرەم بەدڵێکی پاك لێ وەربگرێت، چونکە تەنهـا بە نوسینـەکـانیـا ناسیـومـەو جارێکیش لەوشـاشـە بچوکەی تەلەفزیۆنی کەرکوك لە چاوپێکەوتنێکدا چاوم پێی کەوتووە..

پەراوێزو سەرچاوە

١ ـ ئەو برگەیە لە چیرۆکی هاوار گۆڤاری بەیان ١٤٨

● ژمارەکانی هاوکاری وتارەکەی مکرم رشید طالبانی لەسەر ملوانکەی ئەڵماس

● پاشکۆی عێراق ژ ٧٤ و ٧٥

● پێشوازی خاوەن شکۆو، دوو چیرۆکنوس (دڵشاد مەریوانی) چاپخانەی ڕاپەرین سلێمانی ١٩٧٣.

● هاوکاری وتارەکەی کاك غفور صالح (من و قەڵەمەکەم)

● پرۆژەی ڕەخنەو لێکۆڵینەوە (محمد مام ئەورەحمان)



# چاوپێکەوتنێکی ناکام

● رێبوار محمد یوسف ●

**له ساڵی ١٩٨١ له مانگی «٣»ی بەهاری ئەوساڵه مامۆستای بەرێز «عبدالله صالح بابکر» چاوپێکەوتنێکی لەگەڵ خوالێ خۆش بوو «محمد فیدا» سازدابوو بۆ ئەوەی هەر رۆژێك بێت ئەو وتوووێژه بکەوێتە بەرچاوی خوێنەران و خۆی بە لاپەرەی رۆژنامەکان ئاشنا بکات.**

**مامۆستای بەرێزیش ئەو نووسینەی پاراست و بەڵێنی ناردنەکەی نەهێنابووە دی. ئیتر بە هەر شێوەیەك بێت، مامۆستا خۆی دەزانێ بۆچی نەی ناردووە.**

**مامۆستا وای بە باش زانیوو ئەو نوسراوەیە بدرێتە نزیك ترین کەسی خۆی ئەوەبوو رۆژێکیان ئەو چاوپێکەوتنەی بۆ هێنام، منیش بریارم دا وەکو خۆی بیخەمە بەرچاوی ئێوەی بەرێز...**

بەرێزان ئەو شەوەی مامۆستا سەعید زەنگەنە لە بەرنامەی روشنبیری و کوردی هەواڵی دەرچوونی کتیبی «رەش و سپی» مامۆستا محمد فیدا ی بە کۆمەلانی خەلك راگەیاند ئەو شەوە «فیدا»ی خوالێ خوش بوو سێ رۆژبوو لە گیانەلای سەرەمەرگدا بوو چاوەروانی نزیك ترین کاتی دەرچوونی «روحی» شیرینی ئەکرد.

ئەوەبوو لە بەرەبەیانی رۆژی ٩/١١/١٩٨٤ لە کات ژمێری ٣٠.٥ی دەقیقەی بەیانی دڵی پاکی لە جوولە کەوت.

منیش بە کۆمەڵێ خەم و پەژارەوە هەر زوو بریاری شووشتنی خوالێ خوش بووم گرتە ئەستوو بە شێوەیەکی جوانیش دوای تەواوبوونی «کفن و دفنم» کرد.

مامۆستای بەرێز لە شە نەرم و نیانەکەی جگە لە ئێش و ئازاری خێزانی هیچ شتێکی پێوە دیار نەبوو بۆیە تاوەکو گیانیشی دەرچوو بەو ئازارەوە تلایەوە.

هەر ئەو رۆژەش بە پێشوازی کۆمەڵێکی بەرفراوان لە خەڵکی شارەکەو ئەدەب دوستان لە کات ژمێری ١٠.١٠ دەقیقەی بەیانی لە گۆرستانی قەلادزێ بە خاك سپێردرا...

ئەمەش دەقی وتوویژەکەیە

## وتوویژ لەگەڵ مامۆستا فیدا

دێ بیمە لەگەڵ ئەو ماڵەی، مامۆستای تیا دەژی دراوسێین. زور جار سەری لێ ئەدەم و تاوێ لای دادەنیشم و کەڵك لە وتەکانی وەردەگرم.

مامۆستا ئەختێ بەساڵاچووە وتەمەنی لام وایە لە پەنجا بەرەو ژوور بێ بەلام بە دیمەن وەها نایەتە بەرچاو. هەموو کاتێ پێنووسێکو پارچە کاغزێکی بە دەستەوەیە بۆ شت لەسەر نووسین. هەر پرسیارێکی لێ بکەی خێرا وەرامت ئەداتەوەو بۆ هەر پێویستییەك زوو بە دەنگتەوە دێ. هێمن و لەسەرخۆیەوە بە دەگمەن ئەبی توورە نابێ. هەر کە لای دانیشتی بە نوکتەی جووان و باس شایان سەرت گەرم دەکاو قسەکانی دەکا بە میوەی شەوچەرەی میوانەکەی.

بە ئاواتەوەبووم کە جارێك بە تایبەتی بچمەلای ولە بارەی ژیان و بەسەرهاتی خۆیەوە پرسیاری لێ بکەم. لەم رۆژانەدا ئاواتەکەم هاتەدی ولە دانیشتنێکا هێزم دابە بەر خۆم و مافم لێ وەرگرت بۆ ئەو

باسە جا کە ماوەی دام بەم پێیە دەستم کرد بە پرسیار لێکردنیو وەرام وەرگرتنەوەی: -

پ - ماموستا ناوی خزمەتت؟ و - موحەممەد.

پ - نازناوت؟ و - فیدا -

پ - لە سەرەتاوە نازناوت - فیدا - بووە؟ و - لە کاتی لاویم دا - ئاوارەم - م کردبوو بە نازناو - بەڵام سیویپێنج ساڵی دەبێ کردومەتە - فیدا.

پ - تەمەنت؟ تەمەنم بە گوێرەی دەفتەر نفووس = پێناسنامە - ٤١ ساڵ.

ئەمما لە راستەقینەدا بە جۆری کە شەوی لەدایك بوونم باوکم لە ناو پەراویکدا یادداشتی کردبوو ٥٣ ساڵی تەواوم. بە دیمەنیش لەمە کەم ترم.

پ - خوێندنت؟ بە منداڵی لە حوجرەخانە - قورئانی پیروز - م تەواو کردووە لەگەڵ خۆێندنی پەراوی - گولستان - ی‌سەعدی بە فارسیو چەند پەراوی تر دوایی کە قوتابخانە لە شارەکەماندا کرایەوە چوومە قوتابخانەو تا پۆلی شەشەمی سەرەتایم خوێندووە.

پ - ماموستا گیان لە کوێ هاتوویە جیهانەوە؟!

و - لە دێیەکی سێو چوار، ماڵی بە ناوی - بێگمە - لە ناوچەی بنگرد سەر بە قەزای پشدەر.

پ - کەی وە لە چ تەمەنێکا چوویتە ناو ژیانی خێزانی‌یەوە؟! وە لە کوێ؟

و - لە تەمەنی ٢٥ ساڵی‌دا ژنم هێناوە - کچی جووتیاری بوو لە دێی ناوەدەشت لە ناوچەی بنگرد - ناوی - رابی - بوو. ماوەی چوار ساڵ حەزمان لە یەکتر کرد دوایی مارەم کردو گواستمەوە - ئەوسا - واتا ساڵی ١٩٥٠ی زایین نەرکی گواستنەوەی ژن وەکوو ئیمرو گران نەبوو - شەش دینار مارەبرین - مزەی بەرگو گواستنەوە لە چوار دینار تێ نەپەری. بەڵام بە داخەوە دوای ساڵێك ئەو ئافرەتە بەسەر منداڵەوە کۆچی دوایی کردو منی بە کوڵی پەژارەوە جێ‌هێشت.

پ - ماموستا لە دێی ناوەدەشت خەریکی چی‌بووی؟

و - ماموستای وانە بووم. ئەوکاتە قوتابخانە لە لادێکاندا نەبوو - منداڵی هەژاران لە خوێندن بێ‌بەش بوون - تەنیا دەولەمەندو ئاغاواتەکان توانای راگرتنی ماموستاو میرزایان هەبوو کە دەرس بە کورکانیان بێژێ. من لەوێ دەرسم بە دوو کوری ئاغا ئەووت و جارو بار دووسێ کورە جووتیارشیم تێکەڵ بەوان دەکرد بۆ دەرس.

پ - چۆن بووی بە هۆنەر؟ وە هۆی چی بوو کە هۆنەریت پەسەند کرد؟

و - سەرنجم دا لە چ رێگەیەکەوە خزمەتی گەل و نیشتمانەکەم بکەم باشە. هەرچی بیرم کردەوە لەو چەرخەدا کە نیشتمانی عیراق لە ژێر دەستی داگیر کەران بوو لە بەکارهێنانی چەکی - شیعرو هۆنراوە ئیتر هیچ شتێ بە مێشکمانەهات. بۆت هۆنریم پەسەند کرد. بەڵام نابێ ئەوەشم لە بیر بچێ کە هۆنراوەکانی ماموستا فانی کە هاوڕێم بوو - زۆر کاری کردە سەر بیرو هەستم وفێری هەڵبەستی کردم.

پ - جگە لە ماموستا فانی - پەیوەندیت لەگەڵ بویژانی تردا هەبوو؟

و - بەڵێ لەگەڵ - ماموستا لافاو کە دانیشتووی قەڵادزێ بوو. وە بە تایبەتی لەگەڵ حاجی توفیق ی پیرەمێردی نەمر - وە لەگەڵ ماموستا گۆران دا.

پ - چۆن پیرەمێردت ناسی؟ وەکەی؟

و - لەسەر داوای پیاو ماقوولانی پشدەر - مێژوویەکم بە هەڵبەست لەسەر شێوەی هەڵبەستەکانی - فیردەوسی - بە ناوی پشدەرنامە هۆنیەوە کە بریتی‌بوو لە «٥» هەزار شیعر - دوایی بردم بۆ سلێمانی لام وایە ساڵی «٤٩» بوو ئەو کاتە تەنیا چاپخانەی ژین هەبوو لەوی ئەویش بە دەست ئیش یان پێ‌دەکرد مێژوویەکەم خستە بەر دەست پیرەمێردو گەلێکی لێ خوێندەوەو پەسەندی کرد بەڵام مزەی چاپکردنیم نەبوو - ئەویش توانای یارمەتی‌دانی نەبوو - پشدەری‌یەکانیش هیمەتیان نەکرد بۆ چاپکردنی. جا لەوەوە پیرەمێردم ناسی.

پ - چۆن ماموستا گۆرانت ناسی؟ وەکەی؟

و - کە لە ناوەدەشت بووم زۆر جار شیعرو چیروکم دەنارد بو ژین بە تایبەت ئەو دەمەی ماموستا گۆران بووە بەڕێوەبەری ژین لە دوای پیرەمێردی نەمر.

جا بەو هۆیەوە ماموستا رۆژنامەی ژینی بە خۆرایی بۆ دەناردم و لە دوورەوە ئاشنا بووین. ئەمما یەکترمان نەدیبوو. لە هەڵێکدا کە چوومە سلێمانی سەرم دا لە دایرەی ژین. کە چوومە ژوورەوە لە ژوورێکدا ماموستا دانیشتبوو چاوێلکە لە چاویا بوو خەریکی نووسین بوو. سڵاوم کرد. وەرامی دامەوەو فەرمووی دانیشە دوایی کە لە نووسین بووەوە. وتی لە کوێ وەهاتووی خێرە؟ وتم لە قەڵادزێوە روانیم گەش بووەو وتی یاخوا بەخێربێت. برادەرێکم لەوناوەیە حەزدەکەم کە رۆیشتی هەندێ رۆژنامەی بۆ بەری. وتم

کێیە؟ وتی کاك محمد فیدایە.

منیش پێ کەنیم. بەو پێکەنینە گومانی بردە سەرم. فەرمووی توخوا تۆ ئەونیت؟!

منیش خۆم پێناساند. زۆری پێ خۆش بوو وەزۆر ریزی گرتم.

خوا لێی خۆش بێ

پ ـ مامۆستا ببوورە بێزاریشم کردووی بە پرسیاران. بەڵام دەمەوێ لە جەنابتان بپرسم لەو ماوەیەدا کە لە ناودەشت بووی هیچ نوکتەی خۆش و شتی سەیرت بیستووە کە بۆم باس بکەی؟

و ـ بەڵێ لە دیوەخانی ئاغا زۆر کەسم ئەدیو زۆر شتم دەبیست. بۆ نموونە: رادیۆ ئەوسەر دەمە لە پشدەر کەم بوو ـ تاکو تەرلە ئاغا ـ کان هەیان بوو. لە دیوەخانی ناودەشت رادیۆ هەبوو ـ بە باتری تەرکاری دەکرد. ئەمما کەس باوەری پێنەبوو. ئەیان وت سیحرە.

چۆن ئەو دەنگە لە بەغداوە دێت. ئەوان هەر ئەیان وت بەغدا. خۆ لە لەنـدەن و ئەمریکا هیچ هەوالیان نەبوو. زەلامێ کە زۆر بێباوەربوو ئەیوت باشە من دەچم لە ماڵی خۆمانەوە بانگتان دەکەم ئاخۆ گوێتان لێیە. ئەگەر دەنگی من نەگاتە ئێوە ئەی چۆن دەنگی بەغدا دەگاتە ئێرە؟ دیارە ئەمە سیحرو جادووە!

هەروەها: کابرایەك لە دیوەخان قسەی بۆ ئاغا دەگێرایەوە ئەیوت. ئاغا بەسەری تۆ دەمەو ئێوارەیەك لە راوێ دەهاتمەوە. گەیشتمە پەنا پەرژینی زێیان گوێچکەم راگرت جار بەجار واقەواقی دەهات و جارۆباریش پێکەنینێ! کە لە دەلاقەیەکەوە سەرنجم دا دەبینم: ورچێ ئاگری کردۆتەوەو ریوییەکیشی بە دەستیەوەبوو. لەپر بزووتێکی لە ئاگرەکە هەڵ دەگرت و دەینا بە قوونی ریوییەکەوە. ریویش دەستی دەکرد بە واقەواق. مام ورچیش قاقا پێدەکەنی.

ئاغاش وتی. ئای لەو درۆیە. خۆ ورچ کە ئاگری دی دەترسێو رادەکا!

هەروەها یەکێ تی هەڵدایە وتی. ئاغا گیان من سەیرترم دیوە. بەهاربوو «٥» کەس بووین چوبووبنە شاخێ بۆ راوەکەو لەپر. باران رایکرد. هەموو رامان کردە ژێر. کە نەکە شاخێ تا تەر نەبین. کاتی خۆشی کردەوە. سەیرمان کرد ئەمە کەنەکە شاخ نیە بەلکوو ـ کارگە ـ بە هەوری بەهار دەرپەریوە.

جا نەمـان کردە نامـەردی. بە تەور داس و تەور کارگـەکەمان شەق کردو هەریەکە کۆلێکی گەورەمان هێنایەوە ماڵ. ئاغاش وتی. پەککـو مردووت مرێ بۆ درۆت. جارێکی تر لە دیوەخان باسی هەزاریو دەوڵـەمەندی دەکرا پیاوێك هەستایە پێ وتی سێ بەسێ تەلاقم کەوتبێ ـ پیـاو پیـاو نییە بزن پیاوە وتیان بە خوا تەلاقت کەوتن. کاتێ چوونـە لای مەلا. وتی قوربان مەبەستم ئەوەبـووە هەرکەس بزنی هەبێ پیاوە. مەلا وتی کەوابێ تەلاقت نەکەوتوون.

پ ـ مامۆستا ببورە ـ دوای ئەوەی هاوسەری یەکەمت کۆچی دوایی کرد هاوسەری ترت هەبووە یان هەر رەبەن بووی؟!

و ـ دوای مردنی هاوسەری خۆشەویستم ماوەی دوو ساڵ بە رەبەنی مامـەوە ـ دوایی ناچـاربووم بە ژن هێنان. بەڵام سەد خۆزگە هەر رەبەن بوومایە چونکە ئەم ژنەی دواییە دەردێکی دوامێ کە بە هیچ لوقمانێ چارەسەر ناکرێ

پ ـ ئایا منداڵت لەو ژنە هەیە؟

و ـ شەش کچ و کورێکم لێی هەیە. ئەمما دایکەکەیان هەموویانی لەمن کردووە بە دوژمن وە ئێستا لە من جیای کردوونەوەو خۆیان پێکـەوەن و من تەنیـاو رەبـەنم هەروەکـوو لە سـەرەتـاوە سروشت بەدبەختیو کەساس بۆ زاناو هونەران دا نابێ.

پ ـ دوای ئەوە کە لە ناو دەشت ـ نەمای رووت کردە کوێ؟!

و ـ چوومە دێ ـ گردبداخ ـ ٥٠ کیلومەتر دوور تر لە رۆژهەلاتی قەلادزێوە. لەوێش هەر مامـۆستای دەرس وتنەوە بووم بە تایبەتی نەك بەرەسـمی ـ

قوتـابییـەکـانم ئێسـتا ـ مودیـری ناحیە ـ مامۆسـتای ناوەندی ـ سەرۆکی شارەوانی وەزۆری تریان لێهەڵ کەوتووە.

پ ـ مامۆستا ئەو شتانەی لە ماوەی مانەوەت دا لە گردبداخ بەسەرت هاتوون چیبوون؟!

و ـ رۆژێ لە رۆژان لای چێشتە نگاو هاتمە خوار بۆ قەلادزێ لە ناو بازار گەیشتم بە نامـە دابـەش کەری پۆستـە، کە منی دی پۆستـەیـەکی پێچـراوەی دامێ دوای ئەوەی دەفتەرەکەی دەستی پێ مۆرکردم. کاتێ هاتمەوە دێ ماڵەوە کردمەوە.

روانیم پەراوێکـو نامـەیـەکـە. کە نامەکەم خوێندەوە. لە لایەن دەزگای زانیاری بالیۆزخانەی ئەمریکاوە لە بەغدا نووسرابوو.

بەم پێیـە «مـامـۆسـتـای بەرێـز ئەوا مێـژووی ژیـانی ـ دوایت ئایزەنهاوەر ـ سەرۆك کۆماری ئێستای ئەمریکامان بۆ ناردی. تکایە بۆمـان بگـۆرە سەر هۆنراوەی کوردی ـ ئەگەر تەواوت کرد خۆت بۆمان بێنە بۆ بەغدا. ئەو کاتە پاداشتی گەورە چاوەروانت دەکات».

کاتێ سەرنجی پەراوەکەم دا بە زمانی عارەبی بوو هەندێکم لێ

خوێندەوە، وەرگێڕانی بۆ من زۆر ئاسان بوو.
دوایی بیرم کردەوە کە کرێنی ئەم کارە بۆ من لە دوارۆژا دەبێتە پەڵەیەکی ڕەش لە سەر مێژووی ژیانم. چۆن دەبێ بوێژێکی کورد خۆی بە کاری وەها نارەوا ماندوو بکات. هەرچەند ئەو کاتە بێ‌پارەو هەژار بووم وە هەرچەند لەوانە بوو کە پاداشتێکی باش لە باتی گۆڕینی ئەو پەڕاوە وەرگرم. بەڵام لەگەڵ ئەمانەشا چاوپۆشیم لێ کردو پەڕاوەکەم ناردەوە بۆ بەغداو نامەیەکم لەگەڵ دا ناردو نووسیم کە ئەم ئەرکە بە من جێ‌بەجێ نابێ.

ئەم ڕووداوە لە ساڵی ٩٥٦ی زا یین بوو.
٢ - ساڵی ٩٥٥ی زایین کە پەیمانی بەغدا لە نێوان - ئێران و عیراق وپاکستان و تورکییە بەسترا. بە تاوانی بڵاوکردنەوەی نووسراو دژی ئەو پەیمانە لە شاری قەڵادزێ. منیان گرت و لە بەندیخانەی شار بەندکرام. لەو ماوەدا کە لە بەندیخانە بووم.
ڕۆژێك قایم مەقام ناردی بە دوام دا. پۆلیسی پاسەوان بردیانم بۆ ژووری ناوبراو کە چوومە ژوورەوە. قایم مەقام منی بە دووکەس کە لەوێ دانیشتبوون ناساندو ئەوانیشی بە من ناساند. ئەو دوو کەسە - مامۆستای زمانی کوردی بوون لە دانشکای ئۆکسفۆردی لەندەن خۆیان ئینگلیزی بوون و کوردی‌یان باش دەزانی.
وتیان. دەگەڕێین بۆ وشەی کوردی پەتی. تکایە وەرامی‌ڕاستی ئەم و شانەمان بدەرەوە. «اشارە - لوم - شەیتان - ناشیرین - نە سارد نە گەرم وە زورێ تر کە هەموویم لەبیر نەماوە.
إشارة : ئاماژە
لوم : پەندرێسك
شەیتان وونی

ناشیرین : دزیو
نە سارد نە گەرم : شیلەتێن
ڕەسمی : شتێکە سەر بە میری بێ
تاپو : شتێکە سەر بە خوت بێ

مخالف : پێچەوانە : ئاوەژوو
نادم : پەشیمان : ژێوان
مجرد : تەنیا : ڕەبەن

المعدة : شیلاوك.
مامۆستاکان زۆریان پێ خۆش بوو وهەموویان نووسی‌یەوەو تکای بەرەڵلا بوونیش یان بۆ کردم لەوێ. قایم مەقام وتی:
لە دەست من دا نی‌یە.
٣ - گۆڤارێك لە لایەن دەزگای زانیاری بالیوزخانەی ئەمریکاوە لە بەغدا لە چەرخی شایەتی‌دا. دەردەچوو بە ناوی - پەیام - جارێکیان لەو گۆڤارەدا پرسیاریان کردبوو: -

«ئایا میری ئەمریکا چ هەنگاوێ هەڵ بگرێ باشە بۆ ئەوەی پلەی ژیان و ئابووری دانیشتوانی ڕۆژ هەڵاتی ناوەڕاست بەرز بێتەوە؟!»وە بۆ ئەم پرسیارە پاداشیان دان بوو.
وە ماوەش مانگێك بوو. لەو ماوەدا زۆر کەس لە ڕووناك بیران و پێۆلێ دانشی‌مەندان تەنانەت تا پلەی دوکتۆراش وەرامیان دابووەو هەموو جارێ وەرامەکان لە گۆڤارەکەدا بلاودەکرایەوە ...ش دەستم دایە پێ‌نووس و چەند بەندێکم نووسی لەو بارەیەوە. بەڵام لە پایانی هەموو بەندەکان دا نووسیم «ئەگەر بێتو میری ئەمریکا دەس لە هەرێمەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست هەڵ بگرێ‌و برواتەوە خاکی خۆی لە هەمووی ڕاست ترە چونکە بە پێی سروشت بەرە بەرە پلەی ژیان و ئابووری دانیشتوانی ڕۆژ هەڵاتی ناوەڕاست بەرزدەبێتەوە»!!.
هەر لەبیرم ماوە لە دوای تەواوبوونی ماوەکە وەرامەکان بە ئاور کرابوون من دەترسام کە ئەو وەرامەم داوەتەوە. کەچی بە پێچەوانە وا دەرنەچوو - پاداشتی یەکەم بەروەرام دانەوەی «مامۆستا شاکر فتاح» قایم مەقامی زاخۆ کەوت.
پاداشتی دووهەم بە وەرامی «مامۆستا مستەفا سالح کەریم» کەوت کە مامۆستا قوتابخانە بوو لە سلێمانی. پاداشتی سێهەم بەر وەرامەکەی من کەوتبوو کە پێ‌نووسێکی پارکەری بوو بۆیان ناردم. بەڵێ رامیاری ئەو سەردەمە وابوو کە ڕاگیرکەر بە هێمنێ بجوولێتەوە! وە ئەمە لە ساڵی ٩٥٤ی زایینی‌دا بوو.

وە زۆر بەسەر هاتی تر کە نووسین یان درێژە دەکێشێ.
پ - مامۆستا بیەخشە چۆن بووی بە مووچەخۆری میری؟ وەکەی؟!
و - میری چەرخی پاشایەتی بۆ ئەوەی خەڵك نارازی نەبن و هەموو ڕۆژی خۆپیشان دان نەکەن دژی - بە تایبەتی لە سلێمانی دەورەیەکی کرد بووە بۆ ئەوانەی بڕوانامەی پۆلی شەشەم یان هەیە لە کوڕو لە کچ، ماوەی سێ مانگەی هاوین ئەیان خوێند. دوایی دایان ئەمەراندن بە مامۆستای بەر نەرەکانیی نەخوندەواری لە دێهات.
منیش بەشداری دەورەکە بووم ساڵی ١٩٥٨ لە سەرەتای مانگی تەمووزەوە. دوای چواردە ڕۆژ شۆڕشی سوپاو گەل کراو

سەرکەوت. شەوێکیان لە قەڵادزەوە تەلەفونیان بۆ کردم کە بچم ببمە مووچەخۆری پوستەو بەرید

دەورەکەم جێهێشت و لە بەریدی قەڵادزێ دامەزرام بە مانگانەی ٩ دینار وئیشەکەم بە شەوبوو. بە ڕۆژیش قوتابخانەم لە ماڵەوە کردەوە.

هاوڕێکانم دوای سێ مانگ دەورەکەیان تەواو کردو فرمانی دامەزرانیان دەرچوو فرمانی دامەزرانی منیش لەگەڵ ئەواندا دەرچوو.

وەبوومە مامۆستای قوتابخانەی - بێگەلاس - لە پشدەر - دوایی دوو ساڵ مامۆستایی. دەورەکەمان هەڵ گیرا چونکە ماموستای - قوتابخانەی مامۆستایان زۆر بووبوون. پانزە کەسیان لێ هەڵبژاردین بۆ دەوری برین پێچی. لەوانە من بەرکەوتم و دەورەم تەواکرد لە سلێمانیو ساڵی ١٩٦١ی زایین دامەزرام بە برین پێچ - المضمد - بۆ دەرمان خانەی سولتانە دێ لە پشدەرو لەوساوە زۆر ئاڵوگۆڕم بەسەرا

هاتووەو جاری وا بووە فرمانەکەم لە کیس چووەو دامەزراومەوە تا ئیستا. وەلەو ماوەیەدا جگە لە نەخۆشی - قرژاڵە - سەرەتان تووشی گەلێ نەخۆشی بووم و دووجار قاچم شکاوەو چەند جاریش - عەمەلیات کراوم لە سلێمانیو لە تاران. دوای هەموانیش نەخۆشی پیری.

پ - مامۆستای بەڕێز ناوی بەرهەمەکانت وە ئەو بەرهەمانەی کە

چاپ کراون تکایە؟

د - بەرهەمی شیعرم زوری فەوتاوەو سوتاوەو نەماوە ئەوانەی کە ماون ئەمانەن.

- دیوانی - کەشکۆل - کە بریتی‌یە لە دەهەزار دێڕ شیعری خوم و چاپ نەکراوەو ئیستا لای خۆم نی‌یە.

ب - مێژووی کوردو کوردستان دانەری مەردووخ گۆڕینی لە

فارسی‌یەوە بۆ کوردیو چاپ کراوە.

جـ - مێژووی کوردناس - دانەری - دوکتور مراد ئەورەنك - گۆڕینی لە فارسی‌یەوە بۆ کوردی پەتی لای مامۆستا کاکەی فەللاح دانراوە بۆ چاپ و هێشتا چاپ نەکراوە.

د - گۆڕینی مێژووی - سواد العراق - بۆ کوردی ئەو بەشەی کە پەیوەندی بە کوردستانەوە هەیە بە هۆنراوە.

هـ - گۆڕینی پەڕاوی - جامع التمثیل - بە پەخشان بۆ کوردی کە چاپ نەکراوەو لای خومە.

و - گۆڕینی پەڕاوی - قصص - بە هۆنراوەی کوردی کە چاپ نەکراوەو لای خوم نی‌یە.

ز - گۆڕینی پەڕاوی - گوڵستان - لە فارسی‌یەوە بۆ کوردی کە چاپ نەکراوە لای خۆم نی‌یە.

حـ - پەڕاوی - فەقێ ئەحمەدی - دارەشمانە باپیرە گەورەی بابان کە دانراوی خۆمەو چاپ نەکراوە.

طـ - گۆڕینی پەڕای - المثل الكامل - بە پەخشان کە چاپ نەکراوە.

ي - پەڕاوی - هەمەچەشنە -. بە هۆنراوەو پەخشان دانراوی خۆمەو چاپ نەکراوە.

ك - ژیان و سەرگوروشتەی حضرەتی - محمد - د.خ بە هۆنراوەی

کوردی دانراوی خۆم چاپ نەکراوە

ل - پەند نامەی - فیدا - کە هۆنراوەیەو چاپ نەکراوە.

م - مێژووی - پشدەرنامە - کە ٥ هەزار شیعربوو چاپ نەکراوە.

ن - وە ئێستا زۆر هۆنراوەم لە ناو دوو دەفتەرا هەیە ئەوا خەریکم لە دیوانێکدا کۆیان دەکەمەوەو هێشتا ناوی لێ نەنراوەو هیچی تر...

پ - دوایین هیوات چی‌یە لەم پایانی تەمەنەدا؟

و - زۆر حەزدەکەم تا ماوم دیوانی هۆنراوەکانی خۆم بە چاپکراوی بە دەس هاونیشتمانانەوە ببینم چونکە وەکو لە پرسیارەکەت وتت - پایانی تەمەن - بەڵێ لە پایانی تەمەن دام و بە دەس نەخۆشی گورچیلەوە داماوم. پزیشکەکان ئەڵێن ناتوانین دەستیان لێ بدەین چونکە پەکیان کەوتووە.

ئەم پەك کەوتنی گورچیلەش. ئەوەندە ناخایەنێو دەگاتە کۆچی

دوایی کە مردم گەردنم ئازاد بکەن و جاروبار بە خوێندنەوەی شیعرەکانم یادم بکەنەوە لەسەر گۆڕەکەم کتێب خانەکەم و پەڕاوەکانی خۆم - دانراو - وەرگێڕاو - حەواڵەی. قوتابی ژیر کاکە مەحموود خدرە - دەبێ خاوەنەتی‌یان بکا - هەرچی لە ماڵ و سامان کە لای خۆم هەمە ئێستا هەمووی داومە بە مزگەوتی ئەو شوێنەی لێ دەمرم و ئامۆژگاری نامەم لەو بارەیەوە نووسیوەو مۆرکراوە کوڕو کچ ماڵی

خۆیان جیایەو میرات گری من نین. دوا ئاواتیشم مردنە بە ئیمانەوەو بەختیاری کوردو کوردستان [illegible]چوارچیوەی یاسای عیراقی خۆشەویستا.

پ - حەزدەکەم پارچە هۆن[illegible]ەکی خوت و چەند پرسیارێ لەو پرسیارانەی کردووتن لەگەڵ وەرامەکەیاندا بفەرمووی بۆ یادگاری لەگەڵ وێنەیەکی خۆت. زۆر سوپاس.

و - بەڵێ بەسەرچاو: - پێغەمبەر د.خ. فەرموویەتی «العلم فريضة على كل مسلم ومسلمه»

**دەرمانی گەل هەر خوێندنە**

**خوێندەوار بەرزو مەزنە**

نەخوێندەواری مردنە
بە ڕۆژی ڕوون ڕێگەی ونە

* * *

خوێندن بۆ ژن و بۆ پیاوە
تەنیا بو پیاو دانەنراوە
ژنیش لەم خەوە هەستاوە
ئەڵێ کەی کاتی نووستنە

* * *

کۆمەڵی بێ خوێندەواری
تووشی سزایەو بیماری
هەر بە خوێندن دەکرێ چاری
کە مەرجی هەر پیاو ژنە

* * *

گەلان بە خوێندن پێگەیین
پەیدایان کردوە هێزو تین
کەوتوونە سەر ڕێبازی ژین
هەر خوێندن هۆی سەرکەوتنە

* * *

بە هۆی خوێندن چوونە ناو مانگ
دەستیان کردە هاوارو بانگ
مایەی هێزو چالاکی‌یە
شا ڕێگەی هیوای تۆو منە

* * *

بۆ بازرگان و کرێکار
بو پالەو سەپان و جووتیار
بۆ ئاغاو مسکین و هەژار
هانا بو خوێندن بردنە

* * *

ئەی کوردی ئازاو قارەمان
ئەی نەتەوەی زەندو کەیان
هەستە وەرە ریزی گەلان
بژی دەرچو لەم مردنە

* * *

ئەوەی نەخوێنێ مردووە
ناونیشانی بزر بووە
زانا بە زانین زیندووە
نەزان دیویکی پرچنە

* * *

برای ژیرم هەر بخوێنە
مەرجی خوێندن بسەلمێنە
سەریش لە خوت مەشێوینە
لەگەڵ زانین دڵ بەستنە

* * *

پرسیاری ۲۳ لە ۳٥ پرسیارەکە ئەمەیە «مانای ئەم هۆنراوە عەربیە چی‌یە؟!»

«هل رأيتم ثولبة تابعها ثولية في عنقها ترناتيل؟»

ڕۆژێ ئیمامی عەلی ڕەزای خوای لێ‌بێ لەبەر دەرگای مزگەوت لەگەڵ کۆمەڵێ لە موسوڵمانەکان ڕاوەستابوو لەو کاتەدا پیرێ ژنێکی دێهاتی بە پەشۆکاوی هات و ڕووی لە کۆمەلەکە کردو ئەو پرسیارەی سەرەوەی کرد. کەسیان نەیان زانی. بەڵام ئیمامی عەلی فەرمووی نە، - پیرێژن ڕویی.

دوایی لە ئیمام پرسرا ئەوە چی ئەویست؟

وتی. ئەڵێ «مانگایەکتان نەدیوە گوێرەکەیەك بە دوایەوە بی‌و تاکە پێلاوێکی لە مل دا بێ»؟

لە پرسیاری ژمارە - ١٤ - ئەڵێ چ گەلێ زووتر پەنسلینی دوزیەوە؟ ویەکەم مرۆڤ کێ بووە کە دەرزی پەنسلینی لە خۆی‌داوە لە جیهان؟ وەرام: گەلی کورد - هەر کاتێ مانگا یان ولاخە بەرزەیەك تووشی نەخۆشی - مەقاوی - گەروگیرانی - بوایە... نانێکیان دەخستە قوژبنیکەوە تا کەڕوو بێنی کە نانەکە کەڕووی دەگرت. دەرخواردی ولاخەکەیان ئەداو بەو کەڕووە کە پەنسلینی پێ دەڵێن ولاخەکە چاك دەبووە. وە یەکەم مروڤ کە پەنسلینی لێ درا لە جیهان دا «وینستون چەرچڵ» سەرۆك وەزیرانی ئەوسای بریتانیا بووە لە پرسیاری ژمارە - ٨ - ئەڵێ - ئەو وتە چی‌یە کە نەخوا فەرموویەتی‌و نە پیغەمبەر بەڵام هەرکەس نەی‌زانی کافرە.

ئەو وتە - شادەو ئیمانە. لە کاتی چوونی حصرەتی محمد د.خ بۆ میحراج جبرەئیلی ئەمین لەگەڵ فریشتەکان وتویانە

زۆر سوپاس بۆ تۆ ئەی مامۆستای بەرێز بە ڕاستی هەرچەند سەرم هێشاندی ئەمما کەڵکی زۆرم لەو پرسیارو وەرامە وەرگرت کە بو من زور بەنرخن.

دلسوزت .ع
عبد الله صالح بابكر

پەراوێز :-

١ - خوێنەری هێژا ڕۆژی لەدایك بوونی فیدا گوندی «بیگمە»نی‌یە بەڵکو خەڵکی شارۆچکەی بانەی ئەودیوە بارو سەردەمی ئەوکاتەی چاوپیکەوتنەکەی خواستووە کە بنوسێ بێگمە.

جا وا بۆ مێژوو ڕاستی بە بارە ڕاستەقینەکەی خۆیدا دەرمان خستەوە

٢ - شووشتن..

تەنها مەسەلە مرۆڤایەتیەکە بووەو بەس...

# زمانی چیا

هارۆلد پینتەر          وەرگێرانی د. عبداللە دەباغ

بۆ یەکەم جار لە ساڵی ١٩٨٨دا دەزگای «فەیبەر و فەیبەر» لە لەندەن چاپی کردووە.

MOUNTAIN LANGUAGE

HAROLD PINTER

First Publishd in 1988 by Faber and Faber Limited - London

## پێشەکی:

*(زمانی چیا) یەکەمین شانۆگەرییە هارۆلد پینتەر بینووسێ لە ساڵی ١٩٨٤ەوە بینووسێ و بۆ یەکەمین جار لەسەر شانۆی نیشتمانی (National Theatre) لە لەندەن لە ٢٠/١٠/١٩٨٨ دا پێشکەش کرا.*

شانۆگەرییەکە بریتییە لە زنجیرەیەك وێنەی درامی دەربارەی زمان و چەوسانەوە.

هارۆلد پینتەر ـ کە بە یەکێك لە شانۆگەربێ ـ نووسە هەرەگەورەکانی هاوچەرخی بەریتانیا دەژمێردرێت ـ لە گەڕەکی ئیست لەندەن لە ساڵی ١٩٣٠دا لە دایك بووەو ئێستا لە لەندەن، لەگەڵ ئەنتونیا فرەیزەری ژنی، دەژی.

## بۆ ئەنتونیا

کەسەکان

ژنیکی گەنج

ژنیکی پیر

باش چاووش

ئەفسەر

پاسەوان

بەندی

پیاوێکی کلێنە لە سەر

پاسەوانی دووەم

- ١ -

## دیواری بەندیخانەیەك

(ریزێك ژن. ژنیکی پیر دەستی خۆی دەلاوێنێتەوە. سەبەتەیەك لەلای پێیەوە دانراوە. ژنیکی لاودەستی لە ملی پیرێژنەکە کردووە.

باش چاوشێك دێتە ژوورەوەو لە دوای ئەوئەفسەرێك. باش چاووشەکە دەستنیشانی ژنە گەنجەکە دەکات.)

**باش چاووش:** ناو؟

**ژنی گەنج:** ناوی خۆمان داوە.

**باش چاووش:** ناو؟

**ژنی گەنج:** ناوی خۆمان داوە.

**باش چاووش:** ناو؟

**ئەفسەر** (بۆ باش چاووش):

ئەم بەزمە گەوادیی یە بەسە. (بۆ ژنەکە)

سکالاتان هەیە؟

**ژنی گەنج:** دەستی گەستراوە؟

**ئەفسەر:** کێ؟

(وەستان.)

کێ؟ دەستی کێ گەستراوە؟

**ژنی گەنج:** ئەم دەستی گەستراوە. دەستی پارچە بووە سەیرکە. دەستی گەستراوە. ئەمە خوێنە.

**باش چاووش:** (بۆ ژنی گەنج[illegible]ت چیە؟

**ئەفسەر:** وس بە.

(ئەروات بۆ لای پیرێژنەک

دەستت چی لێ هاتوە؟ کەس دەستی توی گەستوە؟

(ژنەکە لەسەر خۆ دەستی بەرزدەکاتەوە.

ئەفسەرەکە لێی ورددەبێتەوە.)

کێ ئەوەی کرد؟ کێ دەستتی گەست؟

**ژنی گەنج:** سەگێکی دوژبرمان پێنشەر.[1].

**ئەفسەر:** کامیان؟

(وەستان)

کامیان؟

(وەستان.)

ـاووش!

(باش چاووش دێتە پێشەوە.)

**باش چاووش:** گەورەم!

**ئەفسەر.** سەیری دەستی ئەوژنە بکە. وابزانم کەڵەمووستی لێ دەبێتەوە.

(بۆ پیرێژنەکە کێ ئەوەی کرد!؟

ژنەکە تێی ڕادەمێنێ.

کێ ئەوەی کرد؟

**ژنی گەنج:** سەگەکی گەورە.

**ئەفسەر:** ناوی چی بوو؟

(وەستان).

ناوی چی بوو؟

(وەستان.)

هەمـوو سەگێـك ناوێکی هەیـە! بەو ناوە وەڵام ئەدەنـەوە دایـك و باوکیان ناویـان لێ دەنێن و ئەوەش دەبێتـە ناویـان، پێش ئەوەی گازبگـرن ناوی خۆیان دەڵێن.

ئەمـەرێ‌ورەسمێکی میـری‌یـە. ناوی چی بـوو؟ ئەگـەر بزانم یەکێـك لە سەگـەکـانی ئێمـە ئەوژنـەی گەستەوە بە بێ ئەوەی ناوی خۆی بڵێت ئەو سەگە بە ئیعدام دەدەم!

(بێ‌دەنگی.)

ئێستا ـ ئاگاداری! بێ‌دەنگی و ئاگاداری! باش چاووش!

باش چاووش! گەورەم!

**ئەفسەر:** سکالاکان وەربگرە.

**باش چاووش:** سکالاتان هەیە؟ کێ سکالای هەیە؟

**ژنی گەنج:** پێمان وترابوو لە سەعات نۆ[illegible] بەیانی‌یە بێن.

**باش چاووش:** ڕاستە. زۆر ڕاستە. سەعات نۆی ئەم بەیانی‌یە. قەطعەن ڕاستە. سکالات چی‌یە؟

**ژنی گەنج:** ئێمە لە ساعات نۆی ئەو بەیانی‌یە لێرە بووین. ئێستا سەعات پێنجە. ئەوە هەشت سەعاتە ئێمە لێرە وەستاوین. لە ژێر بەفردا.

ئێـوە ڕێگا ئەدەن دوژبرمان پێنشەرەکان ئێمە بترسێنن. یەکێکیانیش دەستی ئەوژنەی گەست.

**ئەفسەر:** ناوی ئەو سەگە چی بوو؟

(ژنەکە سەیری دەکات.)

**ژنی گەنج:** ناوی نازانم.

**باش چاووش:** ئەگەر ڕێگام بدەیت گەورەم؟

**ئەفسەر:** بڵێ.

**باش چاووش:** مێـردەکـانیـان، کوڕەکـانتان. باوکەکانتان، ئەوپیاوانەی چاوەڕێن بیان بینن، ئاودەستخانەن.

دوژمنانی دەوڵەتن. گودخانەن.

**ئەفســەر:** ئێستـا گوێ لەمـە بگـرن. ئێـوە خەڵکی چیـان. گوێتان لێمە؟ زمـانتـان مردووە. قەدەغـەیە. قەدەغەیە لێرە بە زمانی چیاتان قسە بکەن. نابێ بە زمـانی خۆتـان لەگـەڵ پیـاوەکـانتـان قسـەبکەن. ئەوە قەدەغەیە. تێ‌دەگـەن؟ نابێ قسـەی پێ‌بکەن. دژی یاسایە. دەتوانن تەنها بە زمانی پایتـەخت قســە بکـەن. هەر ئەوزمانە ڕێگا دراوە لێرە قسـەی پێ بکرێت. زۆر خەراپ سزا دەدرێن ئەگــەر هەوڵتــان دا لێـرە بە زمــانی چیـاتـان قســەبکـەن. ئەمە فەرمانێکی سەربازی‌یە. ئەمە یاسایە. زمانتان قەدەغە کراوە. مردووە. ڕێگا نادرێ کەس قسـەی پێ بکات.

زمانتان ئیتر نەماوە. کەس پرسیاری هەیە؟

**ژنی گەنج:** من زمانی چیا نازانم

بێ‌دەنـگـی. ئەفســـەر و باش چاووش لەســـەرخـــۆ دەورەی دەگـــرن.

باش چاووشەکە دەستی لەسەر کۆمی دادەنێ.)

**باش چاووش:** بە چ زمانێك قسەدەکەیت؟

بە چ زمانێك لە کۆمتەوە قسە دەکەیت؟

ئەفسەر: باش چاووش، ئەوژنانە تا ئێستا هیچ تاوانێکیان نی‌یە. ئەمەت لە بیر نەچێت.

**باش چاووش:** گەورەم! بەڵام خۆ تۆ نالێیت ئەوان هیچ گوناهیان نی‌یە؟

**ئەفسەر:** ئا، نا، ئا، نا. من ئەوە نالێم.

**باش چاووش:** ئەمەیان پڕە لە گوناه. هەڵدەپەڕێت پێوەیانەوە.

**ئەفسەر:** زمانی چیا قسە ناکات.

(ژنەکە لە دەستی باش چاووشەکە دوور دەکەوێتەوەو ڕوودەکاتە دوو پیاوەکە.)

**ژنی گەنج:** ناوم سارا جۆنسنـە. هاتـووم مێردم ببینم. ئەوە مافی خۆمە. مێردم لە کوێ‌یە؟

**ئەفسەر:** ئەوراقەکانتم پیشان بدە.

(پارچە قاقەزێکی دەداتێ. سەیری دەکات و ڕوو لە باش چاووش کە دەکات.)

خەڵکی چیاکان نی‌یە. بە هەڵە لەگەڵ ئەو کۆمەڵە دانراوە.

**باش چاووش:** ژنەکەش هەروەها. لە ڕوشنبیری نامەرد دەکات.

ئەفسەر: بەلاَم تۆوتت سمتی نەنەرێنەوە.
باش چاووش: سمتی رۆشنبیران لە هەموان باشتر دەنەرێتەوە.
(تاریکی)

## - ٢ -

## ژووری سەردانکەران

(بەندێك دانیشتووە. پیرێژنەکە دانیشتووە، بە سەبەتەکەوە، پاسەوانێك لە پشتی‌یەوە وەستاوە.
بەندیەکەو ژنەکە بە زارێکی قورسی لادێیانە قسەدەکەن.)
(بێ‌دەنگی.)
**پیرێژن:** نانم هەیە.
(پاسەوانەکە دارەکی تێ رادەکەنێ)
**پاسەوان:** قەدەغەیە. زمان قەدەغەیە.
(ژنەکە سەیری دەکات. دارەکەی تێ رادەکەنێ.)
قەدەغەیە. (بۆ بەندیەکە) پێی بڵێ بە زمانی پایتەخت قسەبکات.
**بەندی:** ناتوانێ قسەی پێ بکات
(بێ‌دەنگی.)
نازانێ قسەی پێ‌بکات.
(بێ‌دەنگی.)
**پیرێژن:** سێوم هەیە.
(پاسەوانەکە دارەکەی تێ رادەکاو هاوار دەکا)
**پاسەوان:** قەدەغەیە! قەدەغەیە قەدەغەیە قەدەغەیە!
پێغەمبەر! (بۆ بەندیەکە) تێ‌دەگا من چی ئەڵێم؟
بەندی نا.
**پاسەوان:** تێ‌ناگا؟
(خوارئەبێتەوە بەسەری‌دا)
تێ‌ناگەی؟
(ژنەکە تێی رادەمێنێ.)
**بەندی:** پیرە تێ‌ناگا.
**پاسەوان:** خەتای کێ‌یە؟
(بێ‌دەنگی)
خەتای من نی‌یە، ئەوە پێتان بڵێم. شتێکی تریشتان پێ دەڵێم. من ژنێك و سێ منالم هەیەو ئیوە هەمووتان کۆمەڵێك گوون.
(بێ‌دەنگی)
**بەندی:** من ژنێك و سێ منالم هەیە.
**پاسەوان:** تۆ چی؟
(بێ‌دەنگی)
تۆ چیت هەیە؟
(بێ‌دەنگی.)
چیت پێ وتم؟ تۆ چیت هەیە؟
(بێ‌دەنگی.)
(تەلەفۆنەکە هەڵدەگرێت و یەك نمرە بادەدات.
باش چاووش؟ من لە ژووری شینم....
ئا.... بە باشم زانی ئاگادارت بکەم، باش چاووش...
لام وایە گاڵتەچی‌یەکم لێرە بۆپەیدابووە.
(چراکان دەبنە نیوتاریك. کەسەکان نابزوون تەنها دەنگەکان.)
دەنگی پیرێژن: بەبەکە چاوەڕێت دەکا.
دەنگی بەندی: دەستت گەستراوە.
دەنگی پیرێژن: هەموویان چاوەڕێت دەکەن.
دەنگی بەندی: ئەوە دەستی دیکمیان گەستوە.
دەنگی پیرێژن: کە دێیتەوە ماڵەوە بەخێرهاتنێکی زۆر گەورەت بۆ دەکەن. هەموو کەس چاوەڕێی تۆبە هەمووبان چاوەڕێی تۆن. هەموو چاوەڕێی بینینی تۆن.
(چراکان دادەگیرسێنەوە. باش چاووشە کە دێتە ژوورەوە.
باش چاووش. کام گاڵتە چی؟
(تاریکی)

## - ٣ -

## (دەنگ لە تاریکی)

**دەنگی باش چاووش: کێ‌یە ئەو ژنە نامەردە؟**
**ئەو ژنە نامەردە چی ئەکا لێرە؟ کێ رێگای ئەو ژنە نامەردەی دا لەو دەرگا پووچەلەوە بێتە ژوورەوە؟**
**دەنگی پاسەوانی دووەم: ئەوە ژن یەتی.**
**چراکان دادەگیرسێنەوە.**
**(کوریدۆرێك)**
**(پاسەوانەکەو باش چاووشەکە پیاو[illegible] کلێنە لە سەریان گرتوە. ژنە گەنجەکە نەختێك لە دوورەوە تێ[illegible]ادەمینێ.)**
**باش چاووش:** ئەمە چی‌یە، پیشوازی‌یە بۆخانم خاتوون؟
کوانێ شامپانیا بە لەعنەتەکە؟ کێ شامپانیا بە لەعنەتەکەی پێ‌یە بۆخانم خاتوون؟
(بۆ لای ژنە گەنجەکە دەچێت.)
مەرحەبا، خانم. وابزانم تۆزێك ناریکی لە بەرێوبردندا رووی‌داوە بە

دەرگایەکی هەڵەوە تۆیان ناردووە. مێشك بڕوای پێ ناکات.
یەکێك تووش دەبێت بۆ ئەم هەڵـدیە. بە هەرحاڵ، لەوماوەیەدا، ئەتوانم چیت بۆ بکەم، خانمی ئازیز، هەروەکو جاران لە سینەما دەیان وت؟

(چراکان بە نیوەیی دادەگیرسێن. کەسەکان نابزوون. تەنها دەنگەکان.)

دەنگی پیـاو سـەیـرت دەکـەم کە دەنـویت و دوایی چاوەکانت دەکریتەوە. سەیرم دەکەیت من لە سەرتەووم و پێ دەکەنیت.)

دەنگی ژنی گەنـج : تۆ پێ دەکـەنیت. کە چاوەکـانم دەکـرێنـەوە، من تۆ دەبینم لە سەرمی یەوەو پێ دەکەنم

دەنگی پیاو: ئێمە لە دەرەوەیی لە سەر کانی یەکدا.

دەنگی ژنی گەنج : بەهارە.

دەنگی پیاو: دەتگرم ـ گەرمت دەکەمەوە.

دەنگی ژنی گەنج : کە چاوەکانم دەکرێنەوە من تۆ دەبینم لە سەرمی یەوەو پێ دەکەنم.

(چـراکـانی دادەگیـرسێنـەوە. پیـاوە کلێتـە لەسـەرکـە لەخـۆ دەچێت و دەکەوێت. ژنە گەنجەکە هاوار دەکات.)

**ژنی گەنج** : چارلی!

(باش چاووشەکە پەنجەکانی دەتەقێنی پاسەوانەکە پیاوەکە ڕادەکێشی.)

**باش چاووش** : ئا، تۆ لە دەرگا هەڵەکەوە هاتیتە ژ وورەوە.

ئەبێ خەتای کومپیوتەرەکە بێت.

کومپیـوتـەرەکـە دوو فتقی هەیە. بەلام شتێکت پێ بلێم ـ ئەگەر دەتەوێت هیـچ شتێـك دەربـارەی هیـچ بابـەتێکی ژیـان لەو جێگایەدا بزانیت ئێمە کابـرایـەکمـان هەیـە دیتە ئەم دایرەیە هەموو سێ شەممەیەك. تەنها ئەگەر باران نەبێت ئەو پیـاوە زۆر باش بەسـەر ئەوبابـەتـەدا زاڵـە هەڵیبژاردووە بۆ خۆی. سەرێـکـی لێ بدە لەوڕۆژانـەوپێی خۆش دەبێت بتبینێت. ناوی دۆکسی. جۆزێف دۆکسی.

**ژنی گەنـج** : دەتـوانم لاقـەی بکـەم؟ ئەگـەر لاقـەم کرد هەموو شتێك دێتە جێگای خۆی.

**باش چاووش** : بێ گومان. هیچ گیروگرفت نابێ.

**ژنی گەنج** : سوپاس.

(تاریکی.)

ـ ٤ ـ

## ژووری سەردانکەران

پاسەوان. پیرێژن. بەندی

(بێ دەنگی.)

(بـەنـدیـەکـە دەم وچـاوی خوێناویە. بە لەرزە لەرزەوە دانیشتووە. ژنەکە نابزوێت. پاسەوانەکە لە پەنجەرەکەوە سەیری دەرەوە دەکات.

دەخولێتەوە بۆ ئەوەی سەیری هەردووکیان بکات)

**پاسـەوان** : ئا، بیـرم چوو پێتـان بلێم تەعلیمـاتـەکانیان گۆڕیوە. دەتوانێ قسەبکات. دەتوانێ بە زمانی خۆی قسەبکات. تا پێ ڕاگەیاندنێکی تر.

**بەندی** : دەتوانێ قسە بکات؟

**پاسەوان** : ئا. تا پێ ڕاگەیاندنێکی تر تەعلیماتی تازەیە؟

(وەستان.)

**بەندی** : دایە، دەتوانی قسەبکەیت.

(وەستان.)

دایە، من قسەت لەگەڵدا دەکەم. دەبینی؟ دەتوانین قسـەبکەین. دەتوانی بە زمانی خۆمان قسەم لەگەڵدا بکەیت.

(نابزوێت.)

دەتوانی قسە بکەیت.

(وەستان.)

دایە. گوێت لێ مە؟ من بە زمانی خۆمان قسەت لەگەڵدا دەکەم.

(وەستان.)

گوێت لێ مە؟

(وەستان.)

ئەوە زمانی خۆمانە.)

(وەستان.)

ناتوانی گوێت لێم بێت؟ گوێت لێ مە؟

(وەلام ناداتەوە.)

دایە؟

پاسەوان: پێی بلێ دەتوانێ بە زمانی خۆی قـسەبکات.

تەعلیماتی تازەیە. تا پێ ڕاگەیاندنێکی تر.

بەندی. دایە؟

(وەلام ناداتەوە. بێ بزوتنەوە دانیشتووە.

لەرزە لەرزی بەنـدیـەکـە پتر دەبێت. لە کورسی یەکەی دەکەوێتە خوارەوە بەسـەر ئەژنـۆکـانیـەوەو دەست پێ دەکـات هەنـاسەی سوار بێت و زۆر بە توندی بلەرزێت.

باش چاووشـەکـە دێتـە ژ وورەوەو بە وردی سەیـری بەنـدیەکە دەکات کە لەسەر ئەرزەکە دەلەرزێت.)

باش چاووش: (بـۆ پاسـەوان) سەیری ئەوە بکە. ئەم هەموو زەحمەتی یە دەکێشی بۆ ئەوەی یارمەتی یەکیان بدەیت و ئەوان لاقەی هەموویانت بۆ دەکەن.

(تـــاریـــکـــی)

**پەراوێز** :

**١ ـ سەگی دۆبـرمـان پینشـەر جۆرە سەگێکی ئەلەمانی یە، مووی نەرم و کلکێکی کورتی هەیە. (وەرگێر).**

# پەڵە هەورێك بەسەر چیای قەوقازەوە

● فوزي عبد المجيد ●

نووسەری گەورەی سۆڤیەتی /ئەناتولی برستافکین/ دەڵی:

«کاتێك رۆمانە بەناوبانگەکەی /ئیڤان دینیسوفتش/ بڵاوکرایەوە، دوو ریگامان لەبەردەم مایەوە: یا ئەوەتا لە نێو واقیعەتی سۆشیالیزم دا بمێنینەوەو پەلەقاژێ بکەین، ئەمەش ئەوە دەگەیێنێ کە ئەدەبی سۆڤیەتی کۆتایی پێ‌دێ، یاخود دەبێ رێبازی /سۆلیجینستین/ بگرین. . وەکو گەلێ نووسەر، رچەی دەوومم گرت. ئەمەش پێویستی بەو (باجە) بوو کە دەبێ مل کەچی سانسۆر بین، ئەم باجەشمان دا.».

رۆمانی [پەڵە هەورێك بەسەر قەوقازەوە]ی نووسەری بەناوبانگ /اناتولی برستافکین/ بەم پێیە بۆ ماوەی شەش ساڵی رەبەق قەدەغە کرا. نووسەر ساڵی ۱۹۸۱ نووسیویەتی، بۆ ماوەیەکی زۆر بە نهێنی ئەم دەست و ئەوەدەستی دێ‌کراو بە نهێنی دەخوێنرایەوە، تا گۆڤارێکی بچووك بەزنجیرە لە ساڵی ۱۹۸۷ دا بڵاوی کردەوە.

هەر کە ئەم رۆمانە بڵاویووەوە بووە هۆی دەمەتەقێ‌یەکی فراوان، پەلەیەکی تری تاوانبارکردنی سەردەمی ستالینەو چووە پاڵ گەلێ رۆمانی چاکی‌تر کە ئەوانیش ئەو سەردەمە شوومە تاوانبار دەکەن. وەکو رۆمانە کەی ئەناتولی ریباکوف کە بە ناوی (منالانی ئەریات) [illegible] ئەم رۆمانە رووداوێکی ساڵانی ۱۹٤٤ مان بۆ دەخاتە روو. . . لە ساڵی ۱۹٤٤دا هەزاران منداڵ لە مۆسکۆوە بۆ قەوقاز گویزرانەوە، دەبوایە لە گەڵ ئەو منداڵانەشدا دەیان خانەی بەخێوکردن و پەروەردەکردنی منالی هەتیو لەگەڵ ئەو منداڵانەدا بۆ قەوقاز بگوێزرێنەوەو لەو چۆڵایی‌یانەدا بژین چونکی دانشتوانەکانی

ئەوێ‌یـانـ[...]وازتبـووەوە بۆ جێگـایـانی دیکـە بە تایبـەتی (تـشـیـتـیـانـەکـان) کە بەوە تاوان بار کرابـوون لەگـەڵ نازی‌یەکـان دا دەستیـان تێکەڵ کردووە، بەڵام قوقاز ئەوکاتە بەجارێ چوڵ نەبـوو بوو، هەنـدێ لە دانیشتـوانی ناوچەکە روویـان لە شاخ کردبـوو، ناو بەنـاو هێـرشیـان دەبـردە سەر ئەوانەی تازە هاتبوونە ناوچەکانیانەوەو دێهات و زەوی‌و ماڵ و خانـویـاتیـان لێ داگیر کردبوون. لەو (٥٠٠) مناڵانەی کە لە مۆسکـۆوە بۆ قوقازیان هێنابوون ئەناتولی بریستافکین یان لە گەڵ دابـوو کە ئەو دەمـە تەمـەنی ١٢ ـ ١٣ساڵان بوو. کە قوقـازەکـان هێـرش دەبـەنـە ئەو ناوە تەنهـا ئەناتولی رزگاری دەبێ.. ئەم روداوە بریـسـتـافـکـین لە رۆمـانـەکـەی‌دا دەیگێـرێتـەوە. هەرچەندە لەژێ‌نامەو یادداشتەوە نزیکە بەڵام گرنگی لەوە دایـە کە بەسـەرهـاتی خۆیـەتی، ئەوەی روداوی راستەقینە نەبێ، ئەو دوو مناڵەیە کە بەناوی ساشکا و کولکا یە کە دوو منـداڵی برسی‌و یاخین کە غافـروش ی رۆمـانی کوێرەوری‌یەکانی ڤیکتۆر هیگو بەلایانەوە لە جەنتەت دا دەژی.

هەرچەنێ لە رۆمانەکەدا یەکێ لە دوو منداڵەکە دەمرێت، ئەمـەش دەگـەرێتـەوە بۆ ئەوەی کە لەو دۆزەخـەدا بەشێـك لە خودی دەمـرێت و وای نەکـردووە جەوێکی تراجیدی زاڵ بێ بەسـەر رۆمـانـەکـەدا[...]وسـەر جیهـانی ئەو سەردەمـە بۆ وەچـەی ئەمـرۆ دەردەخـات کە رووداوەکـە لە ناوچەکەیان دا بەرپـابـووە. دەرهێنـەرێکی سینەمایی کە خەڵکی ناوچەکەیە [تشیتشان] مافی ئەوەی وەرگرت کە بیکات بە فیلم.

نووسەر بە تیکرایی باسی کوشتار و سووتاندن و سەربرین دەکات.

ئەناتولی دەڵێ: بەرپا کردنی خەباتی سیاسی گەلی گرنگەو توانیمـان لەنـاو یەکێتی نووسەران دا دەستەی پاڵپشت کردنی [بیـروستـرویکا] دامەزرێنین و من و چەند نووسەرێکی دیکە لەم رۆژانەدا دەستمان لە نووسین هەڵگرتووە تا بتوانین کۆڕ و دانیشتن ببـەستین و دەربـارەی ئەم بارە تازەیە بدوێین چونکی ئەمـە ئێستـا لەنـووسین گرنگتـر و بەسوودترە. ئەمەش مانای وانی‌یە کە ناکۆکی لە نێوان نووسەران دا هەیە، بەڵکو مەسەلە ناکۆکی نێوان کۆمەڵە..»

رۆمـانی /پـەڵـەهـەورێـك بەسـەر چیای قوقاز/دا ساڵی ١٩٨٩ چاپ کراو چاپی یەکـەم ١ ملیون و ٢٥٠ هەزاری لێ چاپ کرا. ئێستاش هەوڵی ئەوە دەدەن ئەم رۆمانە بکرێت بە فەرەنسی‌و ئینگلیـزی‌و ئەڵمـانی‌و ئەسپـانی لە سەرەتای مانگی تەمموزدا بەزمـانی ئینگلیـزی دەکەوێتە بازارەوە. هەندێ لە رەخنەگرانی سۆڤیێت وایان داناوە ئەم رۆمانە پاداشتی گەورە وەربگرێت.

# ٨ ی ئاب

# رۆبەرێکی سەوزە لە سەرخاکی نیشتمان دا

# ژ فولكلورێ جيهانا زاروكا





**• صبرية هەكارى •**

قەفتەكا گولێن سوروزەر وموور ژهەمی رەنگا خەملاندی.
ژحەودەكا باخچێن فلكلورێ مە يێ زێرين.
ئەڤ دروومرايێت پڕبها.
ئەڤ دەريا هنگڤينی پڕشان.
ئەڤێن باب و باپيرا بومە هێلای
هەر پەيڤەك ژ ئەڤان گوتنا چرايەكێ هلە قورنەتەك تاری بی روهن دبيت.
هەر پيتەك شەمالكەكە خەتيرەكە بودەستی ريڤنگ وكاروانيا.
ئەڤە هندەك گوتنێن فلكلورينە دەمی دای بوزاروكێت خو دبێژيت دبەر لاندكێرا دەمی دنڤينيت و دهەژينيت.
يان دەمی ژلاندكی دئينتن دەر ددانيتە سەر پی خويان دهەلاڤێژيت و بو زاروكی خو دبێژيت چ كوربيت يان كچ بيت.

مەرگێمن و بەركەتی
هەكو ژخانی دەركەتی
كچكێت گوندی دويڤ كەتی
* * *
مەرگێمن و مەرگينا
گچك چونە سەر گينا
يا جوانتر بوخو ئينا
* * *
مەرگێتن و سەد جارا
سپێدەهياو ئيڤارا
بو دەيكاخو دچيت دارا
* * *
گوريبم گوريانەتی
تويركێ رەش رزيانەتی
بهنا خوەش ژمالامەتی
* * *
گوريبم گورڤە گورڤە
ئاميدييی ب سندورڤە
ميسای ب شمكێت سورڤە
* * *
گوريتە بم چ كەس نە

پیره میرو چ ل دەس نە
حەفت ژن ئینان هێژ بەس نە
* * *
ئەز گۆری، پەز گۆری، رەز گوری
نێری شاخ قلوز گوری
بێریا بسك ئالوز گوری
شقانێ ترتوز گوری
* * *
هەی لایێ داوو لایێ
بابێته چو بە غدایێ
کلی بینیت بو دایێ
دەیکاتە نائیت رایێ
* * *
هەی دایێ کچوچ دایێ
چەند حەجیی ل بەیت اللەیێ
بوتە دێ کەن دوعایێ
داکچوخ بیتە رایێ
* * *
هەرێ کورو تو کوری
شیرو مەتال ل ملی
خواجەیی مازێ کری
نێچیرڤانێ کەو گری
* * *
هەرێ لاوو لاوژو
کراس و دەرپێ پاقژو
نێچیرڤان و کەو کوژو
* * *
هەرێ کورو کورانی
مال ل دێرا بەرانی
فەقەوو قورئان زانی
* * *
هایێ عیسی عیسی عیسی
قەیتانا ل دورێت کیسا
چیچك چونە سەر لیسا
* * *
سەرێ تە سەرێ خێرێ
قەیتانا ل دورێت کێرێ
هەژ ڤیرێ هەتا وێرێ
گوریتە قەشێ دێرێ
* * *
سەرو تو ل ناف سەرابی
بەران و ل ناف کەرابی
تولازێ ناف کچکابی
خوش مێرێ چەپەرابی
* * *
سەروو شاشا ب هەژینە
ملو کورکا ب درینە
دەڤو قورئانێ ب خونیە
دلو خوشیێ ب بینە
* * *
سەرێ هەز و مەزانە
ترێ کەڤنە رەزانە
بەرخێ پیرە پەزانە
خارزایێ کراس قەزانە
* * *
سەرێ هێل و مێلانە
ترێ ناف هەرزێلانە
گولکێ پیرە چێلانە
خارزایێ گەردەن کێلانە
* * *
سەرێ زێر و مێرانە
ترێ نیڤا رەزانە
بەرخکێ بەر میهانە
خارزایێ خوش مێرانە
خودێ وو خودێ وو
نەبارێ نە بەفرێ وو
حەمکو رێڤنگێ رێ وو
دێ چیتە مالا خالێ وو
* * *
خودێ وو توی‌ێ د بینی
پەژانی تێب وەرنیی
چاڤێت دژمنا پەقینی
* * *
خودێ وو بارێ تعالا
دەیست و پێیا بدە تغالا
داب چنە مالێت خالا
* * *
خودێ وو تو مازن کە
ب عەیال و مال و ژنکە
مەرگێ دایێ گوریکە
* * *
لا الاهە الا اللە
سوفیا دابو دیف مەللا
هەتا بر چەمی خەللا
* * *
چەمی خەللا درێژە
ئەو سوفیی پێ قریژە
چو چار ناکەت نڤێژە
* * *
سوفی سوفیێت خودێنە
کەفچك دارێ بەنێ نە
عاشقێ نیکێ و ماشینە

[« ل « طرابلس »ی لیبیا چاڤی من ب هوزانڤـانی فەلسیتنی ئەحمەد دەحبورو چیروك نڤیس «زیاد عبدالفتاح» کەفت و مە گەلـەك ئاخڤتن ل سەر هوزانی کـرو باسی خالی من ئەوی لە «جەنین» شەهید بی هیڤینی ڤێ هوزانی کوب دیاری من دایە هەر دوو ئەدیبیێت فەلـەستینی «زیـاد عبـدالفتـاح» و أحمـد دحبور» و زاروکێت کولنەدەر ل فەلەستینی . . »]

# ئەدیب و نووسەرانی بەڕێز و خۆشەویست

لەم ڕۆژانەی ئێستامان دا تاقە گۆڤارێك هەیێ تایبەتی بێ بۆ ئەدەب تەنها گۆڤاری «بەیان»ە . . لەبەر ئەمەو گەلێ هۆی دیکەش ئەركێكی گرانی لەسەرشانە . پاراستن و تۆماركردن و گەشەپێدانی سامانی ئەدەبی نەتەوایەتیمان و بڵاوكردنەوەی بەرهەمی ئەدەبی هاوچەرخ و توێی ئەدیب و شاعیر و چیرۆكنووسان ئەو بەرهەمانەی كە بۆنی خاكی نیشتمان و خەون و خولیای مرۆی ئەم وڵاتە دەردەبڕن ، ئەو بەرهەمانەی لە رووی شێوەو بیر و دارشتن و دەربڕینەوە واین لەروومان بێ لەگەڵ كاروانی ئەدەبی عێراقی و جیهانی ئەمرۆماندا تێكەڵ بێ و ئێمەش شانازی بەئەدەبەكەمانەوە بكەین بەوەی دەتوانین بەشداری كاروانی ئەدەبی مرۆڤایەتی بكەین .

بەیان گۆڤاری وەچەی نوێمانە ، هەموو بەرهەمێكی لایق و شایستەی ئەم وەچەیە دەبێتە گولێكی نێو گوڵەكانی تر . . بۆیە دەستەی نووسەرانی ئەم گۆڤارە بەردەوام بیر لە هەنگاوی نوێی بەجێ دەكەنەوە . . ئەوەبوو . . دەق و رەخنەمان هێنایە نێو لاپەڕەی ئەم گۆڤارەوەو چەند هەوڵێكمان بڵاوكردەوە . . جالێرەدا بەفرسەتی دەزانین داوا لە نووسەرانی ئازێز بكەین ، هەر دەقێكی بڵاونەكراوەیان بەباش زانی - چ چیرۆك چ شیعر - لەگەڵ رەخنەیەك دا - بەمەرجێ درێژ نەبێ - بنێرن ، ئێمەش بەسوپاسەوە بڵاوی دەكەیتەوە . هەروەها . لەمەولا ، ناو بەناو ، لا لەئەدەبی كلاسیمان دەدەینەوەو حەز دەكەین ئەوانەی شارەزای ئەم لایەنەن چامەیەك ، یا چەند دێڕێك [illegible]ی شاعیرە ناودارەكانمان شی بكەنەوەو جوانكاری [illegible]مانی بنێرن . . حەزیش یەوە دەكەین دەست بۆ ئەدەبی [illegible]لان بەرین و ئەوەی سود بە ئەدەبەكەمان دەگەیەنێ [illegible]رمانە ئەسڵیەكەوە بێ باشترە - نموونەیان لێ بكرێن بەكوردیو لەژێر ناوی ئەدەبی گەلان دا بڵاویكەینەوە گۆڤاری بەیان بەیارمەتی ئێوە ، لە هەنگاوتانی باش ناكەوێت و چاوەڕێی بەرهەمی بەپێزین .

- بەیان -

